به‌ڵگه‌ی به‌راورد

ده‌رباره‌ی

# مێژووی ژیان

دانانی

محی الدین عبد القادر قه‌ره‌داغی

ساڵی ١٩٨٩ ز - ١٤٠٩ هـ

مطبعة اليقظة - بغداد



# بەڵگەی بەراورد

دەربارەی

مێژووی ژیان

دانراوی

محی‌الدین عبدالقادر القرەداغی

بەڕەزامەندی وەزارەتی ڕاگەیاندن لە چــاپ دراوە

## ( ووشــەیەك )

خوێنەری بەڕێز ئەم پەرتوکە کە لە بەردەستایە بڕێتییــە لە کورتەیێ لە مێژووی ژیان وچەند بەلگەیەکی بەراورد کە بەرپەرچی ئەوبیرو باوەڕانە ئەداتەوە کە لە ڕوانگەیەکــی بەرتەسکــەوە ئەڕوانە تاینی پاکی ئیــسلام ۰

ئیتر ڕێزو خۆشەویستیم بۆ هەموو مرۆڤــێ کــە خاوەنــی باوەڕود هەستی مرۆڤایەتیــە ۰

محی‌الدین عبدالقادر قەرەداغی
۱۸/۲/۱۹۸۸/ ز
۳۰ جماد الاخرة ۱٤۰۸ك
۲۹رێ بەندان ۲٦۸۸ کوردی

## ( پێشەکی )

## ( بەناوی خوای بەخشێنەری ئەم بونەوەرە )

سوپاس بۆ پەروەردگارێ کە ئێمەی لە نەبونەوە هێناوە بۆبون ، وە ستایش بۆ ئافەریدەی جیهان ، کە هەرتەو پێویستی ستایشە خوایەتی بۆ کەسێ کەخەور خواردنی‌نیە ، تەلەکەسە ونەکەسیش لەوە وتە هاوەڵو هاوژینەی‌هەیە وتاکە وەهەر ئەو شایستەی خوایەتیە ، وەپەسەندی بۆ کار پەسەند کارێکە کە هەر ئەو پەسەند دیدەیە ، وە جوانی‌بۆ کار جوانکارێکە کە لە قوڕ گلێنەی ئادەمی پەیدا کردو بە تیشکی‌ڕوناکی نیگای خوی ئەملاندی وگیانی کردە خەلاتی ، وە درودێکی هەمیشە تازە بۆ کەسێ کەفەرمویە پێغەمەر بوم هێشتا یا ئادەم لە نێوان ئاو خاکدا لەتیس مابوو ، ئەو پێغەمەرە (د) کە لە سەروی هەر حەوت ئاسمانەکانەوە پەروەردگار بانگی داهێشت و میوانداری بۆکرد وبەهەشت ودۆزەخی‌گەڕاندو وە لەپەوانێ کەمتر بە رابەری کردو جا ڕەوانەی فەرموو بۆ سەر بەندەکانی و بۆ ڕاسپاردەی فەرمانەکانی ، وە درودێ کە پڕبێ لە بەزەیی خودا بۆ سەرباران و خزم و خۆیشانی مەزن و پڕشکۆی .

خوێندەواری ئازیز : ماوەیەکە بە ئاواتەوەم کە کورتە باسێ لە مێژووی بوونەوەر لە پێش بوونیدا و لە گەڵ مێژووی ژیانی باوکە ئادەم و نەوەکانی وە چەند بەلگەیەک بە زمانی شیرینی کوردی ڕێکخەم و بە چاپی بگەیەنم،وە ئەو ڕاستیە بخەمە بەر چاوی خوێندەوار کەهەرچی بێ‌باوەڕ بیلێ هەموی ڕاست و حەقیقەت

نیە بەلکو هەرچی عیلم و زانست هەیە بێ هەڵەو پەڵە نیە جگە
لە عیلمی خواو پێغەمبەرانی و ئەولیاکانی،وە ئەمەوێ لەم کورتەدا
بانگەوازێ بکەم و هاوارکەمە عالەم کە ئادەمیزاد ئادەمیزادەوە
ئەوەی پێغەمبەری خوایەو بەهیچکە مەیمون نیە ، بەڵام ئەم کارە
بەهۆی ئاڵۆ گۆڕەی ناهەمواری ڕۆژگارەوە هەلم بۆ نەڕەخساو
ماوەیەکی بە سەرداتێپەڕی و ئەم ئاواتەم هەر نەهاتە دی .

تا لە ئەنجامدا خوا یارمەتی دام و ئەم پەرتوکەم بە چاپ
گەیاند ، وە هیوا دارم کە ئەم پەرتوکە وەك سەر چاوەیەکی ئاوی
شیرین وەهابێ و زانستی و زانیاری لێی هەڵێنجی و تینوێتی
هەندێ لە خوێندەوارانی پێ بشکێ ، تا خوێندەوارانی گەلەکەمان
لە سەر چەشمەو کاروان سەرای زانیاری پشوییەك بدەن و
ئاوڕێکی پڕ تامەو هەستی زانیاریانە بدەنەوەو بچوێنن و
پەرەوشاری زانیاری هەنگاو هەڵگرن ، نەیادا خوایە خواستە لە
کاروان جێ بمێنن و هاوڕێ پێ کەم بن .

## ( لێ کۆڵینەوە )

وەك ڕوون و ئاشکرایە گەلێ کتێب و پەرتوك دانراوە و زۆرێ
لە زانایان و مێژوو نووسانی کۆن و تازە هەوڵ و تەقالایەکی
یەکجارگەورەو گرانیان داوە و بە و نیازە کە بگەن بەڕاستی و
باوەڕ ، وەکومان لە ئارادا نەمێنێ لەم چەند پرسیارەدا کە ئەمە
کورتەو لەوارەی ئەم پەرتوکەیەو ئەمەش پوختەکەیەتی ، ئایا
پێش ئادەم سەر زەوی ئادەمیزاد یاجۆرکە یا هەر جۆرە
جانەوەرێکی تیادا ژیاوەو ئاوەدانی کردیتەوە یانا ؟

وە ئەگەر هەبوبێ ئایا مێژووی ئەگەڕێتەوە بۆ چەند هەزار یا چەند ملیۆن ساڵێ؟ وە ئەگەر بڵێین لە پێش ئادەما هیچ جانەوەرێ لەم زەویەدا نەژیاوە وەیا ئادەم جێ‌نشینی کەس نەبووە بەڵکو ئەوەکانی بونەتە جێ نشینی ، ئەگەر وایە ئەم مێژووە ئەبێ بگەڕێتەوە بۆ چەند هەزار ساڵێ کە ئەم زەویە ئاوەدان کراوەتەوە ؟ وە لە ئادەمەوە تا پێغەمبەری ئیسلام ئەبێ تێکڕا چەند هەزار ساڵ بێ ؟ ئایا ئادەمیزاد نەوەی ئادەم پێغەمبەرە ؟ (د) یا لە گەنکارەکاندا سروشت دروستی کردووە ئەمانە چەند پرسیارێکن ر ماوەیەکی زۆر بێ وەڵام داماین‌و مابونەوە وەڵامێکم مەبەستە کە دڵنیامان بکاو دڵمان پاڵ بداتەوە وگومان لە ئارادا نەهێڵێ ، بەداخەوە ئەم گرێ کوێرەیە هەر نەکرایەوە ، وە ئەم ئاواتە هەر نەهاتە دی ، تا خوای گەورە دەرگای خێری لە گورزێی ئادەمیزاد کردەوە ، وە پێغەمبەرێکی خۆشەویستی بۆ ڕەوانە کردین ، ئەک هەر بۆسەر ئادەمیزاد بەڵکو ئەو پێغەمبەرە لە لایەن خواوە ڕەوانە کرا بۆسەر جن‌و ئینسی ، وێڕای ئەمانەش خوا کردی بە ڕەحمەت بۆ هەمو عالەم ، هەتا پەری‌و فریشتەی ئاسمانەکانیش لەم ڕەحمەتە بێ بەش نەبون ، وە قورئانی کردە خەڵاتی کە سەر چاوەی هەمو زانست‌و زانیارییەکە ، جا ئەو قورئانیە کە هەڵبژاردەی هەمو کتێبە ئاسمانییەکانە و پیرۆزترین فەرمودەی خوایە ، ئەم گومان‌و دو دڵییەی لابرد لە دڵی ئەو کەسانەدا کە ئیمان لە دڵیانا جێ گیربوە ، وە بەم جۆرە ئەم گرێیە ڕەهابوە

بەداخەوە ئەڵێم ئەگەر دوژمنانی ئایین‌و ئینسان کتێبە

ئاسمانیەکانیان ئەگێڕییا زۆرێکی زۆر زانیاریمان بە دەست دەکەوت ، بە تایبەت (تەورات) کە پڕی بوولە مێژووکارەساتو ڕوداوی ئەم جیهانە، هەر وەك گەلێ لە چاوچنۆکەکان بۆ مەبەستی گڵاوی خۆیان وە لە گەلێ مەنائەدا گۆڕانیان بە سەرا هێنا ، ڕاستیو ویژدانیان خستە ئەولاوە هەرێەکە بە بۆنەی نیازی تایبەتەندی خۆیانەوە بە لای خۆیاندا دایان تاشی و شاری ڕاستیان لێ نا ، بەلام بە هۆی هەوڵو کۆڵنەدەری ڕوناکبیرانەوە و ، بە یارمەتی خواو ڕاستی خوازانەوە ڕۆژێ دێ کە ئەوهەڵانە ڕاست بکرێنەوە !؟

ئەوجا پێغەمبەری ئیسلام ( د ) مانای قورئانی لێك دایەوە و یارانی فەرمودەکانی پێغەمبەریان کۆکردەوە و وەبەدڵ و گیانپاراستیان ، ئەوجا ڕایان گەیاند بە تایبەی دوای خۆیان وە لەوانیشەوە بۆ زانایانو موجتەهیدەکانی ئیسلام ، وە بەم جۆرە یاساو دەستوری ئاسانی ئیسلام شیکار کرایەوە و مەزهەبو ڕێبازیان بۆ دانرا ، وە هەر ئەمرو ئەهییەك هەر فەرمانو بەرگرییەك هەر چیرۆکو مێژوو ڕوداوێ کە خواو پێغەمبەرانی بۆمان باس ئەکەن لە قورئانو حەدیسدا بڕوامان پێ هێناو گومانمان تیادانەماو دڵمان پاڵی دایەوە و دڵنیابوین ، بەلام ئەو کەسانەی کە باوەڕیان بە خوا نییە هەمیشە هان لە دوودڵیو گێژداوو گوماندا ، وە بەم دەزدەوە تا کۆ تایی تەمەنیان دەتلێنەوەو ، وە بە هیچ شێوەیەکیش ڕێگا چارەو چارە سەر کردنیان نییە جگە لەوە کە بگەڕێنەوە بۆڕێگەی ڕاستو باوەڕ بە خودایتەنها .

## ـ بزانـن ـ

ئەگەر خوای دەھەندەو بە بەزەی بە جبریلا قورئانی بۆ پێغەمبەر (د) نە ناردبا و ، پێغەمبەر بۆی مانا لێك نەدا بایەوە و، یارانی فەرمودەکانی خواو پێغەمبەریان پارێزگاری نەکردباو ، موجتەھیدانی ئیسلام ڕێبازو مەزھەبیان دانەنابا ، ھەرگیز نهێنیەکانی قورئانمان بۆ دەرنەدەکەوت ، وە ھەر وەك کاتێکی پێ لە گەوھەری شاراوە سودمان لێ وەر نەدەگرت ، تەنانەت نوێژمان نەدەزانی ھەروەك ئێستەش بێباوەڕەکان نایزانن ، بۆ وێنە خوا ئەفەرموێ ( أَقِيمُوا الصَّلاةَ ) واتە ئێوە نوێژەکانتان بکەن ، ئەمە ئەزانم ؟ بەلام لە ڕۆژێکدا چەند نوێژ ھەیە و لە نوێژێکدا چەند ڕوکوع و کڕنوش ھەیە و ، چەند ھەلسانو دانیشتنی تێدایە و ، لە نوێژدا چی بخوێنیو ھەر وەھا تا دوای ·

ئەگەر پێغەمبەر نەیفەرمویا (د) ( صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي ) واتە چۆن من ئەبینن نوێژەکەم ئێوەش بەم وێنەیە نوێژەکانتان بکەن ·

چونکە پێغەمبەر (د) جوبرەیل پێڕەوی کردووە ، جوبرەیلیش خوا پێی ڕاگەیاندووە ، جا لێرەدا پاسم لە ھەندێ کەس ھەیە کە ئەزانیارییەکی ئەوتۆو نە بەلگەیەکی بە کەلکیان ھەیە و سواری گای ھار بون و تەرێزەکەن لەم ڕاستیە ·

# ( قورئـان )

خوێنەری بەڕێز قورئان گەورەترین کتێبە لـە ناو کتێبـە ئاسمانیەکاندا وە موعجیزەیەکی هەرە گەورەیە لە خودی خۆیدا کەواتە پاڵ پشتیوارمەتی پێویست نیە لە لایەن کەسانێکەوە کـە خۆیان ماچزن و نا تەوانـان ، وەك هەنـدێ لـە خوێنـەران و ڕوناکبیران ئەیانەوێ کە زانست لە گەڵ ماناى قورئاندا بەراورد بکەن و بیان بەستن بە یەکەوە ، وە ئەم پەیوەستیەش هەڵەیەکـی یەکجار زەقە •

بەڵێ گومانلەوەدا نییە کە قورئان و حەدیس سەر چاوەی هەموو زانیاریەکن ، وە بۆمان هەیە کە مانایان لێك بدەینەوە بە مەرجێ کە ئەو مانایانە بە گوێرەی یاسای ڕێزمانێ وئینسانێ ژیر لە کاتی خوێندنەوەدا ڕەخنەی لێ نەگـرێ و بەرەنگـاریو دژایەتی نەکا لە گەڵ زاهیری ئایەتو حەدیسدا ، نەك هەر بۆ مەبەستێکی تایبەتی بەلای خۆیدا دایتاشێ ، جا هەر کەسێ کـە ئەیەوێ دورە هەڵە بێ یا زانیاریو تاقیکاریەکانی بە ترازوی مەداڵەتی قورئان کێشانەو بەراورد بکات ، جا ئەگەر ئەو مانایە دژایەتی ماناى قورئانی نە ئەکرد ئەوە ئەو کاتە ئەو زانیاریە ڕاستەو پشتیپێ ئەبەسرێ ، وە لە مەولاش هەندێ باسی لێـوە ئەکەین نەك قورئان لە گەڵ زانیاریدا بەراورد بکەین ؟ یا وێنەی بۆ ڕاستی ئەم قسەیە بێنینەوە : کاتی خۆی زاناکۆنە یونانیەکان وایان ئەزانی کە ڕۆژ بەدەوری زەویدا ئەسوڕێتـەوە لـــە دوایدا ڕایەکەیان گۆڕی و هاتە سەر ئـەم بـاوەڕە کـەزەوی و ئەستێرەو خولۆکەکانی تر بە دەوری ڕۆژانەگەڕێن ، وەرۆژیش

بە دەوری خۆیدائەسوڕێ ، وەپاش ماوەیەکی تر ڕایان گۆڕیو وتیان : ڕۆژ هەروەکو بە دەوری خۆیدا دەگەڕێ هەر وەهـــا بەدەوری کۆمەڵەی خۆریشدا دەگەڕێ کە بـە نـاو بانگـن بـە کۆمەڵەی خۆر[1] المجموعة الشمسية ٠

ئەمە هەر ئەمە بەڵکو ڕای بەشـی زۆری زانـاو پسـپۆرە یونانیەکان ئێستا ڕوون بووەتەوە کە میلەو زانیـاری تـازە بـە پێچەوانەی ڕاو بۆ چونەکانی ئەوانەوەیە[2] ٠

## ( نهێنی هەر خوادەیزانێ )

خوای گەورە پێغەمبەری خۆشەویستمانی ئاگادار کردەوە بە گەلێ نهێنیو ڕوداوو بەسەرهاتو مێژووی هەزارەهـا سـاڵ لەوەپێشو لەمەوپاشی ئەم جیهانە وەك خـوا ئەفەرموێ : ( تلك مِن أنباءِ الغيبِ نوحيها اليك ماكنت تعلمها أنت ولا قومك من قبل )[3]واتە ئەی پێغەمبەری خوا ئەم هەموو نهێنیە کـە لەم قورئانەدایە لە ڕوداووکارەساتو بەسەرهاتی ئەم جیهانـە سەر سوڕ هێنەرە ، ئێمە بەوەحیو نیگا بە تۆمان ڕاگەیاند ،وە لە پێشدا نەتو دەتزانیو نە هۆزەکەت ٠

هەر وەها خوای یەکتـا پاڵپشـتی ڕاسـتی فەرمودەکانـی پێغەمبەری خۆی دەکات و دەفەرموێ : ( وما ينطـق عـن الهـوى إنْ هو إلاّ وحيٌ يُوحى علّمه شديدُ القُوى ) ٠

واتە هەرگیز پێغەمبەر (د) بە ئـارەزو هەرلـە خۆیـەوە

---

١ ـ تەفسیری نامی ١٣٤ ـ ١٣٥ بەرگی شەش ٠

٢ ـ هود ـ ٤٩ ـ

ئەدواوە بەلکو چی لەرسوورەنیگایەوە لە لایەن خواوە بۆی هاتووە بە هۆی ڕابەری نیگاوە کە جوبرەیلی خاوەن هێزو شکۆمەنـدی دەرگانەکەی خواوە بۆی هاتووە کە واتە : ڕوونبووەوە بۆمان کە هەر ئایەتو حەدیس ئەبنە بەلگەی ڕاستو جێگەی باوەڕ وە هەر بەلگەیەك وەکو ڕۆژی ڕوناك ڕوونو ئاشـکرا نـەبێ جێگـەی باوەڕنیە ، یا وەك بلێین : ئاسمان لە ژورمانەوەیە وزەوی لـــە خوارمانەوەیە یا وەکو دوو دوو چوارو نیوەی چوار ئەکاتــە دوو ・

وەچکە لەمانە لە نێوان باوەڕو گوماندا دادەنرێ ・

بەڵام پێویستە کە عەقل فەرامۆش نەکەین چونکە بە ڕاستی دەورێکی کاریگەری سەرەکی دەبینێ لەم بووارەدا ، وە لە قورئانی ئیمانو باوەڕدا چۆن وانیە ؟ بەلێ هەر بەعەقلو ژیری خوامان ئەدۆزینەوەو ئیمانی پێ دەهێنین ، هەتا پێغەمبەر لەم بارەیەوە دەفەرموێ : ( بەرزیو نزمی دەرەجەو پایەی بەهەشتیان هـــەر بەگوێرەی عەقلە کەواتە عەقل پایەیەکی سەرەکی باوەڕە ئەوەی بە پێویستی دانێ پێویستە وە ئەوەی بە مەحاڵ ونــە گونجـاوی دانێ مەحاڵوونە گونجاوە ، وە ئەوەی بەدروستی بزانێ دروستە ・

هەر فەرمانێ لە لایەن هەر پێغەمبەرێکەوە هاتبێ ئەگەر بــە بەلگەی بتەو سابت بوبوو ئەوە بڕیاری لە سەر ئەدرێ وەگومانی تێدا نیە ・

هەر حەدیسێ کە بەرەنگاری عەقلی دەکرد ئەوە پێویستــە مانایەکی بۆ دانرێ کە دژایەتی لەنێوانیاندا نەمێنێ ・

هەر حەدیسێ دانەکەسێ گێڕابێتیەوە ئەوە نابێ بە بەڵگەی باوەڕ پێ کراو وە گومان دەگەیەنێ ٠بلوری شەهلی سوننەت

هەر وتارو کرداری لە پێغەمبەرانەوە نەقل کرابێ وەدرۆ یاگوناه بگەیەنێ ئیترجیاوازی نیە دانەکەسێ گێڕابێتیەوە یا ناوبانگی دەرکردبێ بەم ڕەنگەبە ( موتەواتەر ) دابنرێ ئەوە هەڵەیەو وەرناگیرێ چونکە پەیوەندی هەڵە بدرێتە پاڵ ( ڕاوی )[1] چاترە لەوەی کە پەیوەندی گوناه بدرێتە پاڵ یەکێ لە پێغەمبەران ٠

هەر حەدیسێ کە درۆ یاگوناه پاڵدابە یەکێ لە پێغەمبەرانەوە بابیش گاتە ڕادەی ( موتەواتەر ) ئەوە ئەگەر بگونجێ ئەبێ لە مانا ئاشکراکەی ڕاگوێزری یا وەها دانرێ کە لە پێش ئەومدا کە بووە بە پێغەمبەر ڕوی داوە ، یا تەرکی ئەولای کردوە ٠

هەر موعجیزەیەك : ئەگەر تەنها کەسێ گێڕابێتیەوە ئەوە گومان ئەبەخشێ وە جێگەی باوەڕ نیە ٠

هەر موعجیزەیێ[2] ئەگەر بە بەڵگەی سابت زانرابێ هەرکەس نینکاری لێ بکا پێی کافر دەبێ ٠

وە هەر شتێ کە جولەکەو خاوەنی کیتابیاسیان لێ وە کردبێ ئەگەر بە درۆ بخرێتەوە گوناه نیە ٠

هەر کتێبێکی ئاسمانی کۆنو تازە ئەگەر لە گەل قورئانا ماناکەی ڕێ دەکەوت ئەوە ڕاستە ، ئەگەر نا، ئەوە گوڕاوە وبەتاڵە خۆ ئەگەر هیچ لەمانە ڕوون نەبووەوە واتە نەمانەزانی ڕاستە

---

١ ــ ڕاوی ــ بەو کەسە دەڵێن کە ئەو حەدیسە ئەگێڕێتەوە٠

٢ ــ موعجیزە = بەو کارە دەڵێن ئادەمیزادی ئاسایی ناتوانێ پێی هەڵسێ جگە لە پێغەمبەران ٠

یا درۆ ، ئەوە بە ڕاست یا درۆ بڕیاری لەسەر نادرێ بڕیاری ئەهلی تەفسیر لە مانای قورئاندا بەلگەی دەم ڕاست نیە و ، بەلکو چەند لایەنی دیکەی هەیە ، وە دروستە لەو مانا لای دەی بۆ مانایەکی تر وە بە مەرجێ کە بگونجێ لە گەل قورئاندا ٠

قورئانی پیرۆز : لەماناو فەلسەفەو حیکمەتو زانیاریو شتی نهێنیو سەر سوڕ هێنەرو غەریب هەرگیز بنەبڕ نایێتو لە بن نایەت ٠

وە هەموو زانایەك : دەتوانێ مانای قورئان لێك داتەوە بە مەرجێ ئەو مانایە دژایەتی نەکا لە گەل باوەڕو ئیماندا وە زیان نەگەیەنێ بە ئاینی پاکی ئیسلام[1] ٠

## ( بوونەوەر لە پێش بوونیدا )

وەك ڕوونو ئاشکرایە لە هەموو کتێبە ئاسمانیەکاندا و وەلە سەر زوبانی هەموو پێغەمەران زانراوە وبیسراوە کە هەر کەسێ ئینکاری بکاو باوەڕی وەهابێ کە بوونەوەر کۆنە واتە : باوەڕی وابێ کە ئەم عالەمو بوونەوەرە قەدیمە ئەوە پێی کافر دەوترێ وە ئەبێ ئینسان باوەڕی هەبێ کە ڕۆژێ بووە ئەم بوونەوەرە نەبووەو جاخوا لە نەبوونەوە دروستی کردووەو هێناویەتی بۆ بوون ، وە جگە لە بەلگەی بیسراوونەقلی بە لای عەقلیشەوە هەر پێویستە ، چونکە ئەگەر وردبینەوە لە هەر دروست کراوێ بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە بەدەستی کەسێ دروست کراوە ٠

پێغەمەری ئیسلام (د) دەفەرموێ خوا هەر بووەو هیچ شتێ لە گەل ئەودا نەبووە ٠

---

1 قصص الانبياء عبدالوهاب النجار ٠

وە خواعەرشی خۆی لەسەر ئاو ڕاگرتبوو ، یەکەم کەس خودایە بەبێ دەست پێ کردن ، وە ئاخر کەسە بە بێ دوایی هاتن ، وە هەمو شتێ لە پێش بوونیدا ئەو دروستی کردووە ، وە لە دوای نەمانو لە ناوچوون هەر ئەو باقییەو دەمێنێتەوە نە بۆ خوا هەوەڵ هەیەو نە ئاخرو دوایی هاتن[1] .

مەسعودی : دەڵێ : خواهەموو شتێکی دروست کرد بە بێ وێنە وەجوانی کردو ڕازاندییەوە بە بێ بناغە

## ( ئەو شتانەی کە لە پێشدا خوا دروستی کردوون )

لەم بارەیەوە زانایانی ئیسلام گەلێ ڕاو بۆ چوونیان هەیە ، وە کێشەیەکی گرانو بە نرخ لە نێوانیاندا ڕوویداوە ، لە چەند حاڵە دا کە لە مەولا دێت :

ئایا یەکەم شت کە خوا دروستی کردووە چی بوو ؟ هەندێ دەڵێن نوری پێغەمەربووە ، چونکە پێغەمەر فەرموویەتی : یەکەم شت کە خوا دروستی کرد نووری من بوو ، وە هەندێ دەڵێن : عەقلە ، وە هەنـدێ دەڵێـن : قەڵـەمە ، وە هەنـدێ دەڵێـن : ئەولەوحەیە کە هەرچی شت هەیە تیایدا نوسراوە کە خودا لـ دوری سپی دروستی کردووە ، وە ناوەکـەی دوو یاقوتی سورە ، وە ئەوەندە گەورەیە ناتوانین لە وەسفیدا بدوێین ، وە چۆنیەتی نازانین .

وەك لە ئەخبارو دووەلدا دەڵێ خوا قەڵەمی دروست کر

---

1 ـ تاریخ الدول لابن العباس .

له گەوهەری که درێژییەکەی پێنج سەد ساڵ ڕێگایە ، وە نوکەکەی دوڵەتەو نوری لێ دەفرێ ، هەر وەك قەڵەمی دونیا له کاتی نووسیندا ڕەنگی لێ دێ •

جا ئافەریدەی جیهان قەوارەی زەوی له وێنەی پۆلێکدا دروست کرد ، هەندێ له زانایان ڕایانوایە که ئەو قەوارەیە شوێن مزگەوتی قودسە وە هەندێتر دەڵێن ژێر ماڵی کەعبەیە •

جا ئافەریدەی جیهان قەوارەی زەوی له وێنەی پۆلێکدا دروستکرد ، بەڵام جیابوونەوەی زەوی له یەکتر بوونی بە حەوت تەبەقەو ئاوەم شێوە پانەو بەرینەی که وتزنه دوای دروست بوونی ئاسمانەکانە وە ، ئەم ئایەتە کراوەتە بەڵگە وەك خوا ئەفەرموێ: (والأرض بعد ذلك دَحيٰها أخرجَ منها ماءَها وَمَرعاها)واتە له دوای دروست کردنی ئاسمانەکان ئەرزمان ڕاخستو پانو بەرینمان کردو ئەمرو کەنداومان تێدا جاری کردو گژو گیاو دارو بەری ڕووەکمان له سەر دروست کردو سەوز کرد •

ئیتر هەر خوایش زانایەو کەس ئاگای له نهێنیەکانی نیە •

## ( باسی ئەو شەوو ڕۆژەی که خوائەرزو )
## ( ئاسمانەکانی تیادا دروست کردووە )

خوای گەورە لە بارەی دروست کردنی ئەرزو ئاسمانەکانەوە دەفەرموێ : ( وهو الّذي خلق السموات والارض في ستة ايّام ثُم استوىٰ علىٰ العرش )

واتە : ئەو خوایە ئەوەندە بە توانایە که ئەرزو ئاسمانەکانی له ماوەی شەش ڕۆژدا دروست کرد ، جادەسەڵاتی بە سەر

عەرشی خۆیدا کرد ، ئایا ئـەو ڕۆژانـەی کە ئەرزو ئاسمانی تیادا دروســت کراوە بە ئەندازەی ڕۆژی دونیـان ، یا وەکـو ڕۆژێکی هەزار سالی ئەم دونیایـە ، لێـرەدا دولایـەن یـادو ڕامانهەیە ٠

یەکەم کە دەلین وەك ڕۆژی دونیا وان ، هەنـدێ لـــە زانایان وەکو موجاهیدو شێخ حەسەنی بەصریو گەلێکیتر لـە سەر ئەم ڕایەن ، چونکە خوا رۆژی دونیـای بەبەحشـەو لـــە نیازدایە ، دووەمڕا ئەمەیە : کـە هەر ڕۆژێ لەوە دونیـا بـە ئەندازەی هەزار سالی ئەم دونیـایە ئەمـەش بـە لایئیبـنو عەباسو هەندێ لە زاناکانەوە ٠

لە پاش دروســت کردنـی ئەرزوئاسـمان : شـەو ڕۆژو قەوارەی مانگەو خـۆر دروستکرا ، جا پێغـەمەری ئیسلام لەم مانایەدا ئەفەرموێ خوای گەورە لە ڕۆژی یەك شـەمەدا زەوی دروست کـردو ، لـە شـەمەدا شاخەکـانی دروسـتکرد ، وە لە سێ شەمەدا ئاسنـی دروست کـرد وە لـە چـوار شـەمەدا دارو ڕووەکو ئاوەدانیو بیابانو کانـە کـانو زیندەوەرانی ئەرزوو ئاوو خۆراکی دروست کرد وە لە ڕۆژی پێنج شەمەدا هەر حەوت ئاسمانەکانی دروست کرد وە لـە ڕۆژی هەینیدا ڕۆژو مانگەو ئەستێرەو فریشتەی دروست کرد ، وە لە کۆتایـی ڕۆژی هەینیدا ئادەمیزادی دروست کرد[1] ٠

بەدی هێنەری جیهان هەموو بونەوەری لە چوار شت بەدی هێناوە ٠

---

١ ــ اخبار الدول ٠

١ ـ یەکەم : فریشتە یا پەری لە نورو ڕوناکی ٠
٢ ـ جنی لە بلێسەی ئاگر ٠
٣ ـ زەیندەوەران لە ئاو ٠
٤ ـ ئادەمیزاد لە قوڕ[1] ٠

دەربارەی پەیدابونی شەوو ڕۆژ کە کامیان لە پێشا دروست بوە لە دولایەنی سەرەکیدا ڕەچاو دەکرێن یەکەمیان : لەو زانایانە هەکرەمەو موجاهیدن کە لە سەر ئەورایەن کە ڕۆژ لە پێشدا دروست بوە ، وە بەڵگەی بۆ دەهێننەوەو دەڵێن ، چونکە ڕۆژ ڕوناکەو ڕوناکیش لەپێش تاریکیدایە دووەم لایەن کە ڕای کۆمەڵەی زاناکانە دەڵێن : شەو ئەسڵو بناغەیە وە ئەم ئایەتەش دەکەن بە بەڵگە وەك خوا ئەفەرموێ (وَآيَةٌ لَهُمُ اللَّيْلُ نَسْلَخُ مِنْهُ النَّهَارَ)واتە : نیشا نەیەکی دیاریمان بۆناردن و پیشانماندان کە بیێتە بەڵگە بۆ دەسەلاتو توانایی خودا کە ئەویش ئەوەیە لە شەو ڕۆژمان بۆ تێوە داڕنی ٠

لێرەدا خوا شەوی پێش ڕۆژ خستوە کە واتە : ڕۆژ لە شەو وەرگیراوە وە جگە لەمەش ( ئیبنو عەبباس ) بڕیاری تەواوی لە سەر ئەداو ئەفەرموێ : ئایا نابینن کاتێ کە ئەرزو ئاسمانەکان لە یەك جیابونەوە لە تاریکی بەولاوە هیچی دی لە نیوانیاندا هەبوو ؟ ٠

---

١ ـ هەرچی بوونەوەر هەیە خوا لەم چوار مادەو عونصورە دروستی کردوە :
١ ـ ئاو ٢ ـ هەوا ٣ ـ ئاگر ٤ ـ خاك
کە پێیان ئەووترێ : العنصر الاربعة ٠

وە هەندێکی کە لە زانایان ئەم ڕایەشیان بە لاوە ڕاست نییە وە دەڵێن : لە پێش دروست بو نوبەدیهاتن هەموو شتێک نوورو ڕۆشنایی خوا بووە هەربووە وە بەلگەش بەم ئایەتە دەهێننەوە کە ئەفەرموێ : ( اللّه نور السموات والارض ) واتە : خودا نوورو ڕۆشنایی هەر حەوت تەبەقەی ئەرزو ئاسمانەکانە وە بە نوری پەروەردگار ڕوناکە . وە بە عەدلو دادی ئەوڕاوەستاوە ، وە منیش دەڵێم خوا ئەفەرموێ ـ ( وفوق کل ذی علم علیم ) واتە : لە ژور هەموزانایەکەوە زاناهەیە ، ئانەکاتە کەسێ کە زاناتری زانایانەوە بە تواناتری کار بە دەستانە ، کە ئەویش پەروەردگاری هەردووجیهانە .

## ( پەیدابوونی زیندەوەرو ڕووەك )

دەربارەی دروست بوونی زیندەوەرو ڕووەك ئەگێرنەوە لە خوانامی بە ناوبانگەوە شێخ محی‌الدینی عەرەبی کە دەڵێ یەکەم شت لە زیندەوەراندا دروست بو مێشلی هەنگ بووە وە ئاخر شت مەیمون ، وە یەکەم شت لە ڕووەکدا قارچکە وە لە ئاخی زەویدا کاتە ئەوجا کشتوکاڵ جا زیندەوەر جا ئادەمیزاد کە ئاخر دروست کراوی خوایە[1] .

## ( پەیدابوونی جلی )

باسی چۆنیەتی جنۆکەو دروستبوونی زورێکی زۆر لە زانایانی کۆنو تازە خۆیان تیادا ماندوو کردووە ، ولێکۆلینەوەو وردەکاریان تیادا کردوە ، بەلام وەك لە پێشدا باسمان کرد

1 ـ اخبار الدول

تهێنی خاوەنی نهێنی دەیزانێ کـە ئەویش خودایـە ، خـوا
ئەفەرموێ ( وخلق الجانّ مِن مارج مِن نار ) واتە : جنۆکـە
خەلق بووە لە بڵێسەو پرژی ئاگر . وە لە هەندێ لە پەرتووکـی
زانا پێشووەکاندا هاتووە دەڵێن  خوا فریشتەو جنی لە یـەك
سەرچاوە خەلق کردووە لە ئاگر بەڵام ئەوانەیان کە پاکن پەرین
وە ئەوانەیان کە پیس و بەدو بێدینن شەیتانن وە ئەوانەیـان
لە نێوان ئەم دوانـەدان جنۆکـەن وە ئەوانـەیـان کەپاکـــن
فریشتەومەلائیکەن ، جا لە پاش ئەوەی کە خوا خەلقی کردن وەك
دەیگێڕنەوە دەست ئەکەن بەگوناهو خراپەو گومڕایی و خوێـن
ڕێژی و ناپەسەندی وەلە فەرمانەکانی خوا دەر ئەچن لە پـاش
ئەمە خوای گەورە هەشتسەد پێغەمەری بۆ ناردن تا بیان خەنە
سەر ڕێگای ڕاست ، بەڵام لە ڕادە بەدەر گومڕابون و یەکە یەکە
هەمو پێغەمەرەکانیان کوشتن ، موقاتیـل : کە زانایەکی بەرزی
ئیسلامە دەڵێ  بە ڕاستی خوا هیچ پێغەمەری لـە ئادەمیـزاد
پێش ئادەم پێغەمەر ڕەوانە نەکردووە بۆ سەر ئەو هۆزانـە ،
بەلکو هەر لە خۆیان خوا پێغەمەری بۆ ناردون ، جا بێ فەرمانیان
کردن و لە سنورو یاساکانی خـواو پێغەمـەری دەرچـون ، وە
پێغەمەرەکانیان گەلێ هەوڵیانداو هەڕەشەیانلێ کـردن بـەڵام
نەهاتنـە سـەر ڕێگای ڕاست وە ئەم ئایەتە کراوەتە پاڵپشت
بـۆ ئـەم بـۆ چونـە کـە خـوا ئەفـەرموێ : ( وَلَّوا الـــی
قومهم منذرین ) واتە : پێغەمەرەکانیان هاتن بۆ ناو قەومەکانیان
بە هەڕەشەو سزای سـەخت ئەگـەر واز لە گومڕایـی نەهێنن و
نەگەڕێنەوە بۆ ڕێگەی ڕاسـت و هەدالەت و دادپەروەری بەڵام بێ
سوودبوو لە پاش ئەمە خوا فریشتەی لە ئاسمانەوە بۆ ناردن وەدایان

بە سەریانداو لە ناویان بردن وەزەوی لە چنگی ئەو جەپەڵانە پاک بووە وە دەڵێن سەرۆکی ئەوفرشتانەی ئەوکاتە شەیتان بووە ئەم بەڵگانە هەموی جێگای باوەڕی تەواو نین و هەر وا لە گوماندا دەمانهێڵێتەوە ·

بەڵام لە بارەی بونیانەوە پێویستە لە سەر هەموو خاوەن باوەڕێ کە ئیمان و باوەڕی تەواوی پێیان هەبێ وە هەر کەسێ ئینکاری بوونی بکات وە یا لە گوماندابێ ئەوە بێ‌ی‌کافردەبێ چونکە ئینکاری بوونی جنۆکە ئینکاری قورئانە وە هەرکەسێ ئینکاری ئایەتێ یاورشەێ یا پیتێ یا سەرێ بۆرێ زیرێ تەنانەت نوختەیەکی قورئان بکات ئەوە بێ‌ی کافردەبێ ، لێرەدا چەند ئایەت و حەدیسێ هەیە کە ئەوە دەگەیەنێ کە لە پێش ئادەم پێغەمەردا ئادەمی و فریشتەو جنی و جانەوەرانی دیکە هەبوون ·
من زۆر جار گوێم لێ بووەو لە پیرو بەساڵاچووەکانم بیستووە کە باسی جانی بنی‌جانیان گێراوەتەوە کە لە پێش ئادەمدا بوون وە ئەم دوو وشەیە بە ناوبانگن و مەشهورە کە دەڵێن : لە جانی بنی جانەوە مەبەست ئەو فەرمودەیەی خوایەکە ئەفەرموێ ( الست' بربکم ) ؟ واتە : ئایا من خوای ئێوەنیم ؟ جا ئەوکەسانەی کە خوا کردوونی بە ئیمان دارلە پێش خەڵقی هەموو مەخلوقاتێکدا وەڵامی خوایان دایەوەو وتیان ( قالوا بلی )واتە : بەڵێ تۆخوای ئێمەی ئەم شتە هەیە یا لە قالو بەلاوە ئەوە وایە · وێڕای ئەمەش زانیاری تازەش پالپشتی ئەم بۆچونانە دەکات و وە دژایەتی لە نێوانیاندا نیە جا یەکێ لەو بەڵگانە ئەم ئایەتەیە : ( واذ قال ربّك للملئكة إنّی جاعل" في الآرض خليفه ) واتە : کاتێ کە خوا فەرمووێ : بە فریشتەکانی ــ من ئەمەوێ جێ نیشینێ لە زەویدا

دابنێم کە مەبەست ئادەمیزادە    زۆر ڕێکەو بەجێیەو لە بارە ئەم مانایە وە لە گەڵ ئەم مەبەستەدا ئەگونجێ هەر وەک دوکەڵ ئەبێتە بەڵگە لە سەر بوونی ئاگر ئەگەر ، نا ، پێشدا ئەم زەویە خالی بوبێ ! ئەبێ ئادەم جێ نشینی کێ بێ ؟ وە هەر لە هەمان کاتیشدا بەلای عەقڵەوە دروستەو بۆ دەسەڵاتی خوا شتێکی نەگونجاو نیە وە هەتا لە هەمو تەبەقەکانی ئەرزو ئاسماندا گیان لە بەرانو جانەوەران هەبوبن ! •

## ( ژیانی سەر زەوی لە پێش جنیدا )

وەک زانایان بۆمان دەگێرنەوە لە پێش جنۆکەدا چەند خەڵق و گیانەوەری لە سەر ئەم ئەرزە ژیاون هەر خوایش زانایە •

کە پێیان وتراوە ــ حەن ــ و ــ بەن ــ وطەم ــ ورەم ــ وەهەر هەموویان لە ناوچوون کە وتویانە یەکەم گیان لە بەر کە زەویان ئاوەدان کردۆتەوە دوو هۆزن وە پێیان وتراوە حەن ــ و بەن ــ وە لە پاش لە ناو چونی ئەمانە جا جنی لەم زەوینەدا نیشتەجێبوون وە ماوەیەکی زۆر خوا پەرستیان کردووەو لە دوایدا وازیان لە بەندایەتی خواهێنارەو گومڕابوون وەدەستیان داوەتە زوڵمو زۆرو خوێن ڕێژی جا خودا لە خودی خۆیان پێغەمەری بۆ ڕەوانە کردن تا واز لە ڕێگەی چەوت بێنن و بچنە سەر ڕێگای ڕاست وە ئەم ئایەتەش بۆ دروستی ئەم ڕایە دەکەنە بەڵگە وەک خوا ئەفەرموێ ( یا معشر الجن والانس آلم یاتکم رُسُلٌ منکم)واتە: خوا لە ڕۆژی دوواییدا لۆمەو سەرزەنشتی بێ باوەڕەکانی جنی و ئادەمیزاد دەکات

وەفەرموێ : ئەی گورووی ئادەمیزادو جنی ئایا پێغەمەرمان لـە
خودی خۆتان بۆ ڕەوانە ــ نەکردن ؟ بەڵێ بـەڵام ئیمانتـان
نەهێناو گومڕابوون ، وە ئیستا کاتی ئەوە هاتووە کە سزاتان
بە دۆزەخ بدرێتەوە .

وە چەند زانایەکی دیکە دەڵێن پێغەمەرەکـەیان فریشتە
بووەوە ناوی یوسف بووە ، ئیمانیـان پێ نەهێناوە ، وە لـــە
فەرمانی دەرچوون وە لە گەڵیا کەوتنە جەنگەوە ، ئەوکاتە خـوا
فریشتەی بۆ یارمەتی پێغەمەرەکەی ناردو و لە ناویـان بردن ،
وڕاویانتان بۆ کەناری بەحـرەکانو ئـەرز پـاك بووەوە لـە
چنگیان ، وە ماوەی هەزار سان لە ئەرزا مانەوە .

( شیعر )

دونیا بۆ هیچ کەس تا سەر نەمـاوە

ئەم ژینـە خـەوە خەیالـــە بـاوە

ئەمڕۆ دۆینێکـەم لـە بیرنەمـاوە

هـاکا هەمرسـان کـەوتینـە دواوە

ئەگێڕنەوە لە ئەولیای گەورە شێخ محی‌الدینی عەرەبیەوە
لە کتیبی فتوحاتـەکەیدا دەڵێ : لە گەڵ قەومێـکدا بـە دەوری
کابەدا دەگەڕامو تەوافم ئەکرد ، وە ئەو هۆزەم نـە دەناسـی ،
گوێم لـە دووشیعریانەوە بوو ، کـە دەیان گـوت ، یەکێ لـەو
شیعرانـەم لە بەر کردو ئەویدیـم لـە بیـر کـرد ، وە ئەمـە
شیعرەکەیە .

لقد طفتم کما طفنا سنیناً لهذا البیت 'طرّاً أجمعینا[1] .

---

١ ــ دائرة المعـارف محمـد فرید وجـدی لاپەڕە ١٢٥
اخبار الدول .

واتە ‌ بە ڕاستی : تەوافتان کرد هەر وەکو ئێمە سالەهایە پۆل پۆلو کۆمەڵ دەهاتینو تەوافی ئەم مالی خوایەمان دەکرد ، ئەلێ پرسیارم لە یەکێ لەوانە کرد وتـم ئێوە کێن ؟ وتی ئێمـە لە نەوەی هەوەڵ باپیرەی ئێوەین ، پێم وت ئێوە تەمەنتان چەندە وتی ئێمە هەزارو چلو تۆ سالە تەمەنمان ، پێم وت کەواتــە ئێوە نزیکی کوڕەکانی ئادەم بوونەتەوە کە ئەوەندە تەمەنتــان درێژە ، وتــی : تــۆ پرسیاری کــام ئادەم لە من ئەکەی ، تا شێ پرسیاری ئەم ئادەمەم لێ بکەی کە لە تۆوە نزیکە ، یا پرسیاری ئادەمی‌ترم لێ دەکەیت ؟

دەلێ بیرم کردەوەو سامم لێ نیشتو لەو کاتەدا حەدیسێکی پێغەمبەرم بیرکەوتەوە کە دەفەرموێ : بە ڕاستی خوا لە پێش ئادەم پێغەمبەردا سەد هەزار ئادەمی کەی دروســت کردووە ، وە ئەم حەدیسە لە جەعفەری سادقەوە بەم شێوەیە گێڕراوەتەوە ، هەروەها لە فتوحاتدا دەلێ : جارێکیان لە عالــەمی ئەرواحــدا لە گەڵ ئیدریسدا کۆبومــەوە وە پرســیاری ئــەم باســەم لــێ کرد ، حەزرەتی ئیدریس فەرمووی : ئەمەی تۆ دەیلیت ڕاستە وە ئێمەی کۆمەڵی پێغەمبەران ئیمانمان هەیە کــە بونەوەر قەدیم نیەو پەیدا بووە بەلام ئەوە نازانین لە کەیدا دەستی پێ کردووە هەر خوا ناسی گەورە دەلێ : بوونەوەر لە کەیــدا دەستی پــێ کردووە ئەم مێژووە نەزانراوە وە لە گەڵ ئەمەشدا بوونــەوەر قەدیم نیەو تازە پەیدابووە ، وە ڕۆژێك بووە کە نەبووە جا لــە دوایدا خوا دروستی کردووە ٠

---

١ ـ دائرة المعارف وجدی لاپەرە ١٢٥ ـ ١٢٦ ٠

## ( شەیتان )

گەلێ باسی چۆنیەتی شەیتان کراوە ، وەزۆرلێی کۆڵراوەتەوە، جا هەر کەس باوەڕی بە بوونی شەیتان نەبێ کافرە ، چونکە باوەڕی بە قورئان نییە وەئەگەر باوەڕی بە قورئان بێ هەرگیز ئینکاری لێ ناکات ، چۆن وانیە پەروەردگار لە دەها جێگەدا لە قورئانا باسی شەیتانی کردووە .

وە لەم بارەیەوە کە شەیتان لە چیەو چۆن لـە بەزەیی خوا بەشی بێ‌ئازانایانی ئیسلام سێ ڕایان هەیە ، وە هەر یەکەیان ئایەت‌و حەدیس ئەکەن بە بەڵگە بۆ ڕاستی بۆچۆنەکانیان ، یەکەم دەڵێن شەیتان لە ئەسڵ‌و بناغەدا فریشتەیەو بەڵگەشیان ئەم ئایەتەیە کە ئەفەرموێ : ( وإذْ قلنا للملئكة اْسجدوا لآدم فَسجدوا إلاّ أبليس ) واتە : کاتێ کە ئێمە وتمانو فەرمانماندا بە فریشتەکان کە کوڕنوشی ڕێز بەرنە بەر ئادەم ، وە هەموو کوڕنوشیان بردوو پەیڕەوی فەرمانەکانی خوایان کرد جگە لە شەیتان ــ کە بێ فەرمانی خوای کردو کوڕنوشی نەبرد .

ئەم مانایە ئەوە دەگەیەنێ کە شەیتان‌و فریشتە لە سەرچاوەدا یەکن .

دووەم ڕا ئەمەیە : کە شەیتان لە جنییە ، وە ئەم ئایەتە کراوەتە بەڵگە کە خوا دەفەرموێ ( إلاّ أبليس كان من الجن فَفَسَقَ عن أمر ربّه ) واتە : لە دوای ئەوە کە فریشتەکان هەموو کوڕنوشیان برد بۆ ئادەم جگە لە شەیتان کە لە سەرچاوەدا جنییە ، وەیاخی بوو لە بەجێ هێنانی فەرمانی خوا ، ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ کە لە جنییە .

وە ڕای سێیەم ئەمەیە : کە شەیتان نە لە فریشتەیەو نە لە جنییە بەڵکو خوا لە ئاگر دروستی کردووە ، هەر وەکو خوا ئادەمی لە قوڕ دروست کرد ٠

## ( فریشتە )

یەکێ لە گرنگترین خەڵقی خوا فریشتەیە ، ئەم جۆرە دروست کراوەی خوا لەشیان وەك شوشە بێ گەردەو ڕوناکە ، وە دەتوانن خۆیان بیەنە وێنەی زۆر شتەوە ، وەبەگەلێ ڕەنگەو بابەتخۆیان بگۆڕن بەڵام ناچنە وێنەی سەگ‌و بەرازو دڕندەی زیان بەخشەوە ، هەندێ لە فریشتە هەمیشە ودایم خەریکی زیکرو خوا پەرستین وە هەرگیز وان لە یادی خواو مل کەچن بۆ فەرمانەکانی خوا ، وەیەك هەناسە غافل نین ، وەبێ گوناهن‌و ، نە نێرن‌و نەمێن ، ئێمە چۆن بە خۆراك دەژین ، ئەوانیش لە خودا پەرستی لەزەت‌و چێژوەردەگرن ، وخەوو خواردنیان نیە ، کاتێ کە خوا بیەوێ دروستیان بکات ، بە بێ دایك‌و باوك وە لە بەینی کاف‌و نوندا دروستیان دەکات ، فریشتە هەن وە بە گوێرەی قورئان گومان لە بونیاندا نیە ، بەڵام وەك هەواو هێزی کارەباو هێزی موقناتیس نابینرێن ، بەڵام جێگا ئەگرن‌و بە خۆی خۆیان ڕادەوەستن ، وە ئێمە لەم دونیایە ئەوان نابینین وە ئەوانیش لەوە دونیا ئێمە نابینن ، وە خاوەنی گیان‌و لەش‌و ئەندامن ٠

جا هەر کەسێ کە باوەڕی بە فریشتە مەلائیکە نەبێ بێ گومان پێی کافرەبێ ، ئیمان‌و باوەڕ بە فریشتە یەکێکە لەو

شەش پایەی ئاینی ئیسلام ، کە ئەگەر یەکێ باوەڕی بە یەکێ لەو شەش پایەیە نەبێ کافرە ، جا هەندێ لەم فریشتانە لە لایەنی خواوە کراون بە کار گوزاری ئەرزو ئاسمانەکان ، وەباو بارانو زیندەوەران بە گشتی ، وە ئادەمیزاد بە تایبەتی وە هەندێکیان عەرشی خوایان هەلگرتووە ، وە هەندێکیان هەر خوا ژمارەیان دەزانێ ، وە کار گێری عەرشو کورسیو لەوحو قەلەمن ، وە تاقمێ لەمانە پێیان ئەووترێ : نەکیرو مونکەر : پرسیار لە مردوو ئەکەن لە گوڕدا یا لەو جێگەیەدا کە تیایدایە •

وە هەندێ تر کار گوزاری حەشرو نەشرو کێشانەو حیسابن ، وە ئەم کۆمەلە بەر پرسیارن لە ڕۆژی دواییدا بۆ پاداشو سزا ، وە هەندێ تر لێ پرساوی پاداشو سزاو عەزابی دۆزەخیانن ، ئەم تاقمە نۆزدە کەسن پانزدە هۆزن سەرۆکیان ناوی مالیکە ، وە تاقمێ تر لێ پرساوی بە هەشتنو سەرۆکیان ناوی ( ریضوان )ە ، وە ئەم فریشتانە چوار پۆلن لە گشتیان گەورەترن یەکەم پۆل ( کەڕوویی ) ، وەدووەمیان ( ڕۆحانی ) وەسێیەمیان هەلگری ( عەرشن ) کە لە دونیادا چوارنو لە وە دونیادا هەشتن ، وە چوارەمیان ( مقربین ) لەم کۆمەلەدا چواریان ناویان زانراوە یەکەم جوبرەئیل کە پایەری وحــیو نیگایە لە خوداوە بۆ پێغەمەران ، دووەم میکائیلە کە کار گزاری ڕزقو ڕۆزییە سێیەم عەزرائیلە کە کارگوزاری گیان کێشانە ، چووارەم ئیسرافیلە کە کارگوزاری صوورە ، ئەم صورە شاخێکە بە ئەندازەی گیانەوەر کونی تێدایە ئامادەیە کە

هەرکات لە لایەن خواوە ئەمری پێ بکات ئەوکاتە فووئەکا بە ئەفخی ( صورا )[1] .

## ( ژمارەی فریشتە )

فریشتەکانی خوا ئەوەندە زۆرن لە ژمارە نایەن وە بۆ ئەم وەڵامە پەنا ئەبەینە بەر حەدیسێکی پێغەمبەر کە دەفەرموێ، ئادەمیزاد دەیەکی جنۆکەیە ، وە بە هەردوکیان دەیەکی زیندەوەرانی دەشتن ، وە بەهەموویان دەیەکی باڵندەن ، وە ئەمانە هەموویان دەیەکی زیندەوەرانی ناوبەحرن ، وە ئەمانە هەموویان دەیەکی فریشتەی سەر زەوین ، وەئەمانە هەموویان دەیەکی فریشتەی ئاسمانی دونیان ، وە ئەمانە گشتی دە یەکی دەیەکی فریشتەی ئاسمانی دووەمن ، وە ئەمانە تا ئێرە دەیەکی فریشتەی ئاسمانی سێیەمن ، وە بەم جۆرە تا ئەگاتە فریشتەی ئاسمانی حەوتەم ، وە تائێرە ئەگەر بەراورد کرێن لە گەڵ فریشتەکانی دەورو بەری کورسی‌دا ئەم ژمارەیە لە چاو ژمارەی دەورو بەری کورسی زۆر کەمن ، جا هەر هەموویان تا ئێرە لە چاو فریشتەی ــ یەکێ لە قاتەکانی عەرشی کە ــ ژمارەی قاتەکانی بریتیە لە شەش سەد هەزار قات ، ئەگەر بێتو

1 ــ صور شاخێکە بە ئەندازەی گیان لە بەران کونی تێدایە حەزرەتی ئیسرافیل دوو جار فووی پیادەکات ، یەکەم هەرچی خاوەن ڕۆحە بە جارێ ئەمرێ ، جا پاش چل ساڵ بۆ جاری دووەم فوو ئەکاتەوە بە صورا ، وە هەموو زیندوو دەبنەوەو ئەبرێن بۆ حەشر .

درێژی‌و پانی‌و قوڵی یەکێ لەو قاتانەی عەرش بەراوردکەین لەگەڵ هەر حەوت قاتەکانی ئەرزو ئاسمانەکانداو وە ئەوشتانەش کە لە ناویاندایە لە چاو یەکێ لە قاتەکانی عەرش شتێکی یەکجار بچوکەو تەنانەت وەك خاڵێك وایە ، وە بە ئەندازەی پەك پێ لە عەرشی خودا جێگا خاڵی نیە وە فریشتەکانی خودا یا لە کوڕنوشدان یا لە ڕوکوعدان‌و یا ڕاوەستاون وە هەر هەموو بەندایەتی‌و یادی خودا ئەکەنەوە ، جا هەر لە هەوەڵەوە تا ئێرە ئەگەر بەراوردی بکەین لە گەڵ ئەو فریشتانەی کە هان لە چواردەوری عەرشی خودا وەك تکێ ئاوە لە بەحرێ ، وە ژمارەی کەس ژمارەو تەمەنیان نەزانراوە وە بۆ کەس ژمارە ناکرێن جگە لەو کەسەی کە خەڵقی کردوون •

## ( فریشتەو ئادەمیزاد )

بە ڕاستی باسی گەورەیی فریشتەو ئادەمیزاد کە کامیان لە کامیان گەورە ترە گەلێ گرنگە ، وە پێویستە ئادەمیزاد لێی بکۆڵێتەوەو بیبانزانێ •

بە کورتی پوختەی ڕای زاناکان : هەندێ دەڵێن فریشتە لە ئادەمیزاد گەورەترە وە ئەم ئایەتە دەکەنە بەڵگە کە خوا دەفەرموێ ( وقُلْنَ حاشا لِلّهِ ما هذا بشرا إن هذا إلا ملكٌ كريم ) واتە : ژنەکانی میسر کە زلێخا بانگی کردبوون‌و میوانداری بۆ کردبوون ، کاتێ کە چاویان بە یوسف کەوت وتیان ، نە بە خوا ئەمە لەوە ناچێ کە ئادەمیزادبێ ، بەڵکو ئەمە فریشتەیەکی خوایە ، ئەم مانایە ئەوە دەگەیەنێ کە فریشتە

له ئادەمیزاد گەورە ترو بە رێز ترە ، وە هەندێ تر دەڵێن : ئادەمیزاد لە فریشتە گەورە ترە چونکە فریشتە خوا هەر بۆ بەندایەتی خەلق کردوون وە ئارەزوویان نیە ، بەلام ئادەمیزاد هەمیشە لە گەل نەفس و ئارەزوویدا خەریکی جەنگە ، وە هەندێ تر دەڵێن فریشتە بە گشتی گەورە ترە لە ئادەمیزاد بە گشتی ، بەلام تایبەت و خاسەی ئادەمیزاد کە پێغەمەرانن لە تایبەت و خاسەی فریشتە گەورە ترن[1] .

## ( مێژووی رۆژگار )

له بارەی مێژووی رۆژگارەوە گەلێ کێشەو لێ کۆلینەوە لە ناو زاناکان و مێژوو نوساندا روی داوە ، جا هەندێ هاتوون چەند حەدیسێکیان بە زوبانی پێغەمەرەوە هەلبەستووەو کردویانە بە بەلگە بۆ راستی راو بۆ چونەکانیان ، هەر یەکە بۆ نیازوو مەبەستێ کەواتە پێویستە بیخەینە بەر چاوی خوێندەواران و بزانرێ کە هەرچی بخرێتە سەر کاغەز راست نیە ، وە پێویستە راست و چەوت لە یەك جیا بکەینەوە ، بۆ وێنە هەندێ لە زانایان دەڵێن لە هەوەل زەمانەوە تا دوایی دوونیا حەوت هەزار ساڵە وە ئەم حەدیسە لە سەر زوبانی ئیبن و عیاسەوە کە ئەویش لە سەعیدی کوری جوبەیرەوە دەیگێڕێتەوە دەلێ ، پێغەمبەر فەرمویەتی لە یەکەم کاتی دروست بوونی رۆژگارەوە تا تەواو بوونی ئەم جیهانە برێتیە لە حەوت هەزار ساڵ ، دیسان وەهبی کوری مەنبە دەلێ : شەش هەزار ساڵە ئەمانەو چەندین هەلبەسراوو کە پەیوەندییان داوە بە پێغەمەرەوە بۆمان روون بووەو کەهیچی حەدیس نیە ،

---

١ ــ قصص الانبياء ، عبدالوهاب النجار لاپەرە١٨ .

وە ئەگــەر حەدیــس بووایــە لــــە مێــژەوە دونیــا دوایــی هاتبووئاخر ببوو ، چونکە هەر چی پێغەمەر فەرمویەتی راستەو جێگای باوەڕەو سوێندی لە سەر بخۆسوێنەکەت ناکەوێ[1]

ئەبوو هورەیرە خوای لێ ڕازی بێ ئەفەرمــوێ پێغەمــەر فەرموویەتی :( بُعثتُ أنا والسّاعة كهاتين ) واشار بالسّبابة والوسطى :واتە بوونم بە پێغەمەرو لە گەڵ دونیا ئاخریدا وەك ئەم دووپەنجەیە وەهان ، وە پەنجەی شادەتوو ناوەڕاستی لکاندووە بە یەکەوە ، وهێمای بۆکردوون ٠

وە ئیبنو عومەر خوایان لێڕازی بێ ئەفەرموێ : پێغەمەر فەرموویەتی : ( أجلكم في أجل من قبلكم مِن صلاة العصر الــى مغرب الشمس ) واتە تەمەنی ئێوە لە چاو تەمەنی پێش خۆتانەوە لە نوێژی عەسرەوە بۆ خۆر ئاوایە ، دیسان پێغەمەر ئەفەرموێ ( بُعثتُ في نفس السّاعة فَسَبَقَتْها كما سبقتْ هذه هذه ) أي كما سبقت الوسطى السّبابة[2] :

واتــە : رەوانە کراوم لــە کاتــی هاتنی ڕۆژی دوایــدا ، تەنهانەوەندە ئەبێ من کەمێ لە ڕۆژی قیامەت پێش کەوتوو تىرم، هەر وەکوو پەنجەی ناوە ڕاست کەمێ لە پەنجەی شادەت پێشــی کەوتووە ، ئەمە پوختەی ڕای هەندێ لە زانایانی ئیسلامە ٠

وە هەندێ جولەکەش کە لە تەوراتەوە دەیگێرنەوە دەڵێن

---

1 ــ ئەم حەدیسانە لە (كامل في التاريخ)دا هەیە لاپەرە١١ هەروەها لە گەڵێ کتێبیتردا ٠

2 ــ تاج بەرگی ــ٥ــ لاپەرە ٣٣١ ٠ واتە : تەمەنی خەڵقی ئادەمیزاد هەتا ئیستادرێژترە تا تەمەنی لە ئێستەوە بۆ دونیا ئاخری ٠

لە دروست بوونی ئادەمەوە تاکۆچی پێغەمەر (د) چوار هەزار وسێسەدو چل و دوو ساڵ دەکات • وە بە لای هەندێ لە گاورە یونانیەکانەوە بەم جۆرەیە : لە دروست بوونی ئادەمەوە ، تا کۆچی پێغەمەر پێنج هەزارو تۆسەدو نەوەدو دوو ساڵو مانگێ دەکات ، هەر وەها مەجوسیەکان دەڵێن : ماوەی ڕۆژگار لە پادشای گیومەرسەوە تاکۆچی پێغەمەر (د)سێ هەزارو سەدو تۆ ساڵ دەکات ، بەڵام لە ژۆر گیومرسەوە هیچ شتێکیان باس نەکردووە ، وە مەسعودی دەڵێ : تەمەنی ئەم جیهانە شەش تا حەوت هەزار ساڵە،هەروەها گاورەکانیش لە سەر ئەم ڕەئیەن،وە دەڵێن : مەجووسییەکان وەها گومان دەبەن ، لە کاتی زەردەشتی کوڕی ئەسپیمانی پێغەمەریانەوە تا ئەسکەندەر دووسەدوو هەشتا ساڵ دەکات[1] •

## ( تەمەنی جیهان بە لای فەیلەسوفەکانەوە )

ڕای گەلێ لە فەیلەسوفەکانی جیهان بەم جۆرەیە ، دەڵێن شەش یا حەوت هەزار ساڵ بۆ هەموو تەمەنی دونیا نە گونجاوە وە عەقل پەسەندی ناکات ، چونکە لە باوکو دایکێ وە لە ماوەی

1 ـ ( مروج الذهب للمسعودی ) لاپەڕە ـ ٢٦٠ ـ ، بەرگی دوو ، جێگەی داخە کەبەشی زۆری مێژوو نوسانی جیهان بە لای هۆزوو ڕەگەزەکەیاندا دایان تاشیوە ، وەڕاستییان پێ شێل کردووە ، وەك کابرای لە مەڕ ؟ بەڵێ مێژوو لە ڕاستیدا ناگۆڕێ بەڵام لە گەلێ جێگەدا گوڕاوەو لەلەمی چاو چنۆکی بۆ براوە •

حەوت هەزار ساڵدا ئەمەندە زیاد ناکاتو بەم شێوەیە پەرە ئاسێنی ، وە ئەگەر بە وردی لێی وردبینەوە ئەم هەموو ڕەنگەو جۆرە کە لە ناو ئادەمیزادا هەیە لە سوورو سپیو ڕەشو بۆر وە جگە لە مەش بە سەدەها زمانو شێوەی ئاخاوتنو گفتۆگۆ لە ناو دانیشتووانی سەر ئەم زەوینەدا پەیدا بووە ، وە ئەم هەموو ئاڵو گۆڕو پەرە سەندنە نەك بەحەوت هەزار ساڵ بەڵکوو پێویستی بە دەها هەزار ساڵ هەیە ٠

بە ڕاستی فەیلەسوفەکان لەم باسەدا نیشانیان پێکاوەو ڕاستیان کردووە ، لە ڕاو بۆ چوونەکەیاندا[1] ئەگێڕنەوە پادشادی میصر کە ( بەتلیموس فیلادلف )ی ناو بووە ، داوای لە زاناو پسپۆری بە ناوبانگ ـ ( مەنیتۆن ) ـ کرد کە هەردوکیان دووسەدە لە پێش عیسادا ژیاون ، کە هەڵسێ بە تالی کردنەوەیەکو ـ کەشمالی زەوینی میصر ، تا بزانێ کۆنترین ڕۆژگاری میصر کە خەڵکی تیادا ژیاوە مێژوی بۆ چەند هەزار ساڵی ئەگەڕێتەوە . لە پاش تالی کردنەوەکە بڕیاریدا کە مێژوی بۆ نزیکەی ( ٣٥٫٠٠٠ ) سیو پێنج هەزار ساڵێ ئەگەڕێتەوە[1] ، وەمێژوو نوسی یونانی ، ( دیودەرسەقلی ) لەو سەدەیەدا ژیاوە کە حەزرەتی عیسای تیادا لە دایك بووە ، دەڵێ : کۆنترین ڕۆژگاری میصر کە مێژووی بۆ نزیکەی ( ٣٣٫٠٠٠ ) سیو سێ هەزار ساڵێ دەگەڕێتەوە ٠

وە مێژوو نوسی هۆزی خالیدی لە مەش زیاتر دادەنێن ، وە ئەم هۆزە سێ سەدە لە پێش عیسادا ژیاون ، دەڵێن : مێژووی پێە

١ ــ دائرة المعارف ، وجدی لاپەرە ١٢٤ بەرگی ١

ماڵـەی خالیدی بۆ نزیکەی ( ٠٠٠ ر ٤٣٠ ) چوار سـەدو سی هەزار ساڵێ دەگەڕێتەوە ، وە لە تۆفانی نوحەوە تا سەر دەمی سەمیرامیس پادشای بابل مێژوودی بـۆ نزیکـەی ( ٠٠٠ ر ٢٥ ) هەزار ساڵ دەگەڕێتەوە ٠

وە کۆمەڵێ لە زانایانی ئینگلیز داوایان لـە ( هۆرنـەر ) زانای جیولۆجیاو زەوی ناسی ئینگلیزی کرد کە سـەر ژمێری تەمەنی ئینسانی میسریان بۆبکـات ، جا ئەو زانایە هەڵسـایە کارەکەیو بیناى ( عیـن الشمـس )ی کـردە سـەر چـاوەی تاقیکارییەکەی وە ووتی مێژووی ئەم بینایە نزیکەی (٣٠٠ر٢) دوو هەزارو سێ سەد ساڵ پێش عیسا ئەم دیوارە کراوە ، بەم جۆرە گڵی تەنیشت دیوارەکەی پاك کردەوەو بەرزیو نزمـی پێوانە کرد کە هەر ساڵەی چەندی لێ خـوراوەو ئەوجـا بـۆی دەرکەوت لە هەر هەموو سەدەیەکدا (١١) یانزە پێی ئینگلیزی لەو دیوارە ڕوخاوەو نەماوە ، کەمـێ مەتـرو هـەژدە گـرێ ئەکات ، ( ١٨ر٣ )م ر هەژدە گرێ واتە لەو دیـوارە لـە نـاو چووە ، ئەوجا کۆنترین شوێنەواری دەستی ئادەمیزادی دانا بە ( ٣٩ )پێ قولایی لە سەر تەختی زەوییەوە ، جا لـە ئەنجامـدا دەڵێ تەمەنی ئادەمیزادی سەر زەوی میسـر مێـژودی بـۆ ( ٠٠٠ر٣٠ ) سی هەزار ساڵێ دەگەڕێتەوە ، وە دەڵێن : لـــە ئەمەریکادا کەللە سەرێکیان دۆزیوەتەوە کە تەمەنـی نزیکـەی ( ٤٠٠ر١٥٨ ) سەدو پەنجاو هەشت هەزارو چوار سـەد سـاڵ دەبێ ، وە زانای ئەمەریکی ( یۆنیت دۆلدن )یش ڕای وایە وە

---

لە دائیرة المعارف وەرگیراوە ٠

لەم قسەیەدا چوونن[1] ، بەڵام وابزانم ئەم بۆ چونانە لە چاو ڕاستیدا چەند خەملاندنێکی سەر پێیە •

## ( پووختەی ئەم باسە )

بە گوێرەی زانیاری یا ئادەم یەکەم کەس نەبووە کە زەوی ئاوەدان کردبێتەوە ، بەلکو گەلێ ئادەم لە پێش ئادەم پێغەمبەردا هەبوون ، بەڵام قڕانیان کردووەو لە ناوچوون ، جا لە پاش کەشماڵو تاقیکارییەکی گران هەندێ لە زانایانی جیهان دەڵێن : مێژووی مرۆڤ دەگەڕێتەوە بۆ یەك ملیون ساڵ کە دروست بووە ، وە هەندێ تر دەڵێن : سێ چارەکە ملیونێکە وە هەندێکی تر دەڵێن : نیو ملیۆن دەبێت وە هەندێ تر لە مەش کەمتر دا دەنێ •

جا دەڵێن مرۆڤی جاوە کۆنترین مرۆڤە ، جا پەکین ، جا سۆلۆ ، جا بەلتداون ، جا هیلد برج ، جا ڕۆدیسیا ، وە هەندێ لە زانایانی ئاینیش دەڵێن : ئەگەر لە پێش ئادەم پێغەمبەردا ئادەم یا مەرگیانەوەری هەبووبێ‌و زەوی ئاوەدان کردبێتەوە نارێك‌و نەگونجاو نییەو ، بەرگری ئاین‌و یاسای خوداناکات ، وە جگە لە مانەش عەقڵیش وەری دەگرێ ، وە بە دروستی دەزانێت ، وە ئەگەر لە هەر حەوت تەبەقەی ئەرزوو ئاسمانەکاندا ژیان هەبێ ، بۆ بە توانایی‌و دەسەڵاتی خودا هیچ نییەو گرن‌و گران نییە •

1 ــ ( دائرة المعارف محمد فريد وجدى ) لاپەر 125 بەرگی یەك لە باسی پادشای میسرەوە ( بەتلیموس ) تایونیت دلدن لە دائرة المعارف وەرگرتووە •

## ( بۆ چوونێ )

هەر وەکو باسمان کرد گەلێ لە زانایانی کۆنو تازە لەم بووارەدا گەلێ هەڵسەنگاندنو بەراوردکارییان تیادا کردووە ، وە لە ئەنجامدا هەر یەکە یاخود کۆمەڵێ لەمانە بڕیاری خۆی لە سەر داوەو بەڵگەی بۆ هێناوەتەوە بە گوێرەی زانیاریو ڕاو بۆ چونی خۆیان ، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ جگە لە فەرمودەکانی خواو پێغەمبەرانی کە ڕێنمایمان دەکەن، وەڕاستیمان پیشان ئەدەن ، وەجێگەی باوەڕی خاوەن باوەڕانن ، تا ئیستا زانستییەکی ئەو تۆمان دەست نەکەوتووە کە جێگەی باوەڕبێ و ، وەك ڕۆژی ڕوناك وەمایێ ، وەدڵمان پاڵ بداتەوە، وەتیئوریەتیمان پێبەخشێ ، لەم قوناغەدا ، مەبەستم لە قوناخی عیلمی غەیبو نهێنیە ، کە جگە لە خوداو پێغەمبەرانی کەس نەیزانیونو ناشی زانن ، چونکە خوا ئەفەرموێ ( لا یعلم الغیب إلا الله )واتە : چیی نهێنیە جگە لە خودا کەس نایزانێ .

وە دەر بارەی دونیا ئاخری خوا ئەفەرموێ ( إن الله عنده علم الساعة )واتە به ڕاستی هەر خودا دەیزانێ کەی دوایی دونیا دێت لە مانای ئەم ئایەتانە وەبۆمان ڕون بووەوە کە جگە لە خودا کەس نهێنیو غەیب نازانێ ، هەتا کەس ناتوانێ تەقدیری ساتێکی تر هەر لە خۆیەوە بکات ، وە هەر ئایەتێ یا هەر حەدیسێ بە گوێرەی ڕێزمانو یاسای ئاین مانا لێ نەدرێتەوە وەرناگیرێ ، وە هەر حەدیسێ نەگاتە پلەی بە ناو بانگ ( موتەواتەر ) باوەڕ نابەخشێ ، بەڵکوو گومان دەگەیەنێ ، وە

---

١ ـ مع الانبياء عفیف عبدالفتاح طبارە ٤٥ .

هەر حەدیسێ نەگونجێ لە گەڵ قورئانداوە عەقڵ پەسەندی نەکات ئەوە حەدیس نیە ، بەڵکو هەڵبەستراوەو جێگای باوەڕنیە •

وە گەلێ لەو هەڵبەستراوانە دوژمنانو ناحەزانی ئیسلام هێناویانەو لە گەڵ فەرمودەی پێغەمەردا تێکەڵیان کردووە ، بۆ ئەوەی ئەم دینە لە کەداربکەن ، وە لە بەر چاوی خەڵکی بخەن ، وە بێ سەلمێنن بە نەخوێندەوارەکان کە یاسای پاکی ئیسلام کۆنەپەرستیە ، وە هەر لە بەر ئەمەشە کە پێغەمبەر هەڕەشە لەو درۆزنانە ئەکات کە درۆ بە دەم پێغەمبەرەوە ئەکەن ، وەك ئەفەرموێ : ( مَنْ كَذَبَ عليَّ متعمداً فليَتَبَوَّءْ مَقعَدَهُ مِنَ النّار ) واتە : هەر کەسێ درۆ بە دەم منەوە هەڵبەستێ یا ئەوکەسە جێگای خۆی لە دۆزەخدا ئامادە بکات •

## ( دونیا ئاخریە )

هەروەك ڕامانبووارد هەر خوا دەزانێ کەی یاپاش چەند سالێکی تر دووایی دنیا دێت ، بەڵام ئەم حەدیسانە کراوە بە بەڵگە لە سەر نزیکی دونیا ئاخربوون ، وەك پێغەمبەر ئەفەرموێ : ( بعثتُ أنا والسّاعةُ كهاتين : واشار بالسبابة والوسطى ) واتە : بوونم بە پێغەمەر لە گەڵ دونیا ئاخریدا وەك ئەم دوو پەنجە وەهان ، وە پەنجەی شادەتو ناوەڕاستی لکاندووە بەیەکەوە ، وە ئەمە بەڵگەیە لە سەر نزیکی دونیا

ئاخری وڕۆژی قیامەت[1] ٠

وە مانایەکی تریشیان لێك داوەتەوە کە ئەمەیە : مـن و دونیا ئاخری وەك ئەم دووپەنجەیە وەهاین کە بەینیان نیـە ٠ وە ئەم حەدیسەش بەلگەیە لە سەر نزیکی نیسبی دونیا ئاخربوون، کە ( عبداللە )ی کوڕی عەمر دەیگێڕێتەوە خوایان لێ ڕازی بێ دەلێ : پێغەمبەر ئەفەرموێ ( اجلکمَ فی أجل مَن قبلکم مـن صلاة العصر الی مغرب الشمس ) واتە : تەمەنوو ماوەی ئێـوە ئـەی ئومەتی پێغەمبەر لە چاوو تەمەنی ئومەتە پێشووەکانـدا لـــە نوێژی عەسرەوە بۆ خۆر ئاوا وایە ٠

ئەم مانایە ئەوە دەگەیەنێ ئێمەی ئومەتی پێغەمبەری ئاخـر زەمان تەمەنمان کەمترە ، لە ئادەمیزادی پێش خۆمـان ، بـەلام

1 ـ زیادە پەنجەی ناوەڕاست لە سەر پەنجەی شـادەت ، نزیکەی سێ یەکی گرێ پەنجەیەکە بێ ئەگەر بێتو بە پێوەرێ لێکی بدەینەوە لـە ئەنجامـدا بۆمان ڕون ئەبێتەوە کە ئەو زیادەیە بریتیە لە چەند هـەزار یـا چەند ملیۆن سالێ ، بەلام لـە بـەر ئەوەی کە ڕوون نەبووەتەوە ئەم جیهانە کەی دەستی پێ کـردووە یا بلێین لەبنی ئەو پەنجەیەوە تا ئەو سـێ یەکـە گـرێ پەنجەیە چەند ملیۆن سالێ دەبێ لە بەر ئەوە دیـاری کردنی ڕۆژی دوایی مەحالە وە یەکێکە لە نهێنییەکانی خوا وەهەر خوا دەیزانێ ، تەنهـا ئـەوە ئەبـێ کـە دەیگەیەنێ دونیا ئاخربوون نزیکە وە ئـەو نزیکیەش نزیکییەکی نیسبیە ٠

ماوەی دیاری کراو ناگەیەنێ چونکە ماوەی تەمەنی پێش خۆمان نازانین

## ( چۆن مێژوو دانرا )

بە کورتی بەم جۆرەیە ئیینو عومەر لە زەهری شەعبییەوە دەیگێڕێتەوە سەرەتای مێژووی ئادەمیزاد لە ئادەم پێغەمەرەوە بوو وە لە ئادەمەوە بۆ حەزرەتی نووح وە لە نووحەوە بۆ حەزرەتی ئیبراهیم وە لە ئیبراهیمەوە بۆ کاتی مەنجەنیقەکەی وە لە دوایدا یونانییەکان لە ئەسکەندەرەوە مێژوویان داناوە لە ئەسکەندەرەوە بۆ قیبط ،وە لە قیبطەوە بۆ بەختەنەصر جا لە پێغەمەرێکەوە بۆ پێغەمەرێکی تر ، تا گەیشتە سالی فیل وە لە ویشەوە بۆ کۆچی پێغەمەر لە مەکەوە بۆ مەدینە ، جا موسولمانەکانیش کۆچی پێغەمەریان کرد بە مێژووی ئیسلام ، وە هۆی ئەم مێژوو دانانەش ئەمەبوو : ئەبو موسای ئەشعەری نامەیەکی بۆ حەزرەتی عومەر نووسی خەلیفەی دووەم ، وەچێ نشینی پێغەمەر کە تیایدا دەڵێ : کاتێ کە نامەمان بۆ ئەنێرن مێژووی تیا نە نوسراوە ، لە پاش ئەمە حەزرەتی ( عومەر ) خەلکەکەی کۆ کردەوەو پرسی پێ کردن ، جا هەندێ ڕایان وا بوو لە پێغەمەریتی پێغەمەرەوە بکەن بە سەرەتای مێژوو ، وە هەندێ تر ووتیان لە کۆچی پێغەمەروە دابنێین جا حەزرەتی عومەر فەرمووی بەڵێ کۆچی پێغەمەر ئەکەین بە سەرەتای مێژووی ئیسلام ، چونکە ئەو

کۆچکردنە فەرلی ڕاستو بەتالی کرد ، وە یەکرنگترین ڕوداو لە مێژوی ئادەمیزادا دائەنرێ ٠

## ( ڕۆژگار بەڵگەیە لە سەر بوونی خوا )

ڕۆژگار یا زەمان ــ تێکڕا ناوە بۆ کاتە کانی شەوو ڕۆژ ، کە پێکتین لە بڕینی چەند ئەندازەو مەودایەك کە قەوارەی خۆرو مانگ هەر یەکەیان لە فەلەکی خۆیاندا دەیبڕن ، بەلام ئەوی ڕاستی بێ هەر کەسێ کە ڕاستو چەپی خۆی لە یەك جیا بکاتەوە ئەزانێ کە زەمان چییەو چۆن ، شەوو دێو ڕۆژ دەبێتەوە ڕۆژ دەڕواو شەوو بە سەرا دێ ، ئەمە لەم بارەیەوە گرنگ نییە ، ئەوەی کە مەبەستو گرنگە ئەمەیە کە زەمان بەلگەیەکی هەرە بە هێزەبۆ بوونی خواو تاكو تەنهایی ئەو خالیقە ٠

خوا ئەفەرموێ ( وَهو الّذی خلق اللّيلَ والنّهار وَالشمسَ والقمر كلٌ فى فلكٍ يَسبحون )[1] واتە : ئەو خالیقە ئەمەندە بە توانایە شەوو ڕۆژوو قەوارەی خۆرومانگی دروست کردووە وە هەر یەکەیان لە ئاسمانی خۆیدا دەگەڕێنو مەلە دەکەن[1] ٠

---

١ ــ هەندێ لە زاناکان ئەڵێن : مانگو خۆروو باقی ئەستێرەکان ئەوەندە ماوە لە نێوانیاندا هەیە ، بە هیچ جۆرێ لە یەك ناکەون ، وە هەر وەك خۆیان دەمێننەوە، بۆ وێنە ماوەی نیوان زەوویو ڕۆژ دوو سەدوو چل ملیۆن میلەوو لە نێوان زەوویو مانگدانەوەدو سێ ملیۆن میلە تەفسیری نامی بەرگی (٦) لاپەرە ١٣٥ ٠

وە ئەگەر کەسێ ئەوەندە زانستی ئەبێ بزانێ شەوو ڕۆژ تازە پەیدابووەو قەدیم نییە ، لای کەسی خۆ ئەزانێ کە شەوو دێتو ڕۆژ دەڕێتەوە ، کەواتە لە گەڵ ئەم فەرقەیاندا نە شەوو لە گەڵ ڕۆژو نە ڕۆژ لە گەڵ شەوداو وە لە کاتێکی دیاریداو لە بەشێکی شەو یا ڕۆژدا هەر گیز مەحاڵە کۆبونەوەیانو بە یەك گەیشتنیان ، هەر وەها پێویستە کە شەوو یا ڕۆژ یەکێکیان لە پێش ئەویکەیاندا هەبووبێ ٠

وە هەر کامیان لە پێش ئەویتردا دروست بووبێ ، ئەوە ئەمی کەیان بێ گومان لە دوای ئەوەوە بە چەند کاتێکی دیاری کراو پەیدا بووە ، کە واتە ئەم وێنەیە کە هێنامانەوە بەلگەیەکی ئاشکرایەو وەك ڕۆژی ڕوناك وایە کە هەر دوکیان تازەنو قەدیم نین ، وە دروست کاری شەوو ڕۆژ هەر خوای تاکو تەنهایەو گومانی تیادانییە

بەلگەیەکی تر لە سەر تازەیی شەوو ڕۆژ وە بەم جۆرەیە هەموو ڕۆژێ لە دوای ڕۆژێکی ترەوە هاتووە وە دەستی پێ کردووە وە ڕۆژێ لە پێشیەوەو ڕۆژێ لە دوایەوە وە ئاشکرایە ئەو ڕۆژەی کە هێشتا نەهاتوو جادێت وەکێ سبەینێ بێ ئەمە تازەیەو ـ قەدیم ـ نیە ، وە گومان لە وەدا نییە کە هەر شتێ بەشێکی تۆزقاڵێکی تازە بێ هەمووی تازەیە ، بۆ چونکە ڕۆژەکانی پێش تریش هەر وەها پەیدابووە ، ئەمڕۆ ئاوێنەیە بۆ پاشو پێشی خۆی ٠

وە بەلگەیەکی تر کە ڕۆژگار تێکڕا تازە پەیدا بووە ئەمەیە : وەك ئاشکرایە شەوو ڕۆژ بریتین لە بڕێکی چەند ژمارەو مەودایەکی دیاری کراوو ، بۆ وێنە ماڵی هەتاوی

سێ‌سەدوو شەستوو شەش ڕۆژو شتێکە ، وە ژمارەی شەوو ڕۆژیش بە تێکڕایی لە ساڵێکدا لەمە بەدەر نییە وە ئەم ڕۆژانەیش یا تاکن یا جووتن ، جا لێی‌وورد ئەبینەوە ئەگەر جووتن هەوەڵی هەموو جووتێ دووە ، وە ئەگەر تاکن هەوەڵی هەمووتاکێ یەکە ، هەر ئەمە ئیسپاتی دەکاتو دەیچەسپێنێ.کەوا شەوو ڕۆژ هەوەڵو دەست پێ کردنی هەیە ، جا پێویستە کە یەکێ بێ دروستی کردبێ‌و لە نەبوونە وە بە دی هێنابێ کە ئەویش خوای بە دیهێنەری جیهانو زەمانە ، وە ڕوونو ئاشکرایشە هەرشتێ دەست پێ کردنی هەبێ ئەنجام کۆتایشی هەر دێ ٠

## ( ڕێبازی گەردوون ئاسمەکان )

زۆر ئاشکرایە ئادەمیزاد لە ڕەوڕەوەی ژیانیدا گەلێ پێویستی بە فەلەکو گەردون ناسی هەیە ، وە پەروەردگار وەك ئامێرێکی بە کەڵك بۆ ژیانی سەر زەویو بەرژەوەندی مرۆو هەزارەها سودو حیکمەتی تر دروستی کردوون ، وە دەربارەی گەردوون ناسی خوا ئەفەرموێ : وعلامات (وبالنجم هم یهتدون) واتە : خودا ئەستێرەکانی ئاسمانی کردووە بە نیشانە بۆ ئەوەی ئادەمیزاد ڕێگای پێ بدۆزێتەوە لە شەوی تاریکدا ، وە کاتی نوێژی پێ بزانن ، وە قیبلەی پێ بدۆزنەوە ، وە پێی بزانن کەی جەژنەو کەی ڕەمەزانە ، وە کەی ڕۆژ یا مانگ ئەگیرێ ، وە گەلێ شتی تری بە کەلك ، وە بە مەرجێ باوەڕی بە خوایەتی گەردون فەلەك نەبێ‌و ، وە قسەش لە نهێنییەکانی خوا نەکات ، خوا ئەفەرموێ لە حەدیسی قودسیدا : هەندێ لە

بەندەکانم نەگۆڕێن‌و باوەڕیان بە من نامێنێ ، وە باوەڕ بە ئەستێرە نەهێنن کە دروست کراوی خوایە .

جا ئێمە باسمان لەو گەردوونناسانەیە کە باوەڕیان بە ئەستێرەو گەردون هێناوە ، ئەمەش پوختەی ڕێبازی گەردونناسە بێ باوەڕەکانە بە کورتی  وەها کوومان ئەبەن کە بوونەوەر کۆنە ( قەدیمە ) وە هەر بووەو گەڕانی ئاسمانەکان گیان ئەکاتە بەر گیان لە بەررو ڕووەك ، وە هەر ئەوو چەرخەو گەڕانەشە کە ئەبێتە هۆی لەوتان‌و لە ناوو چوونیان ، وە دەڵێن : لە نووختەی دەست پێ کردنی گەردونەوە بە گەڕان ژیان دەست پێ دەکات ، وە بە گەڕانەوەی بۆ نوختەی دەست پێ کردن هەموو دەمرن‌و شیناییەکانیش ووشك‌و بێ گیان دەبن ، ـ جا بە چەرخەیەکی تازە سەر لە نوێ ژیانێکی تازە دەست پێ دەکاتەوە .

جگە لە مەش کۆمەڵێ لە گەردون ناسانی هەرەم کە دوای ڕێ‌و ڕێچکەی یونانیەکان کەوتوون ، ئەڵێن  گوایە گەردوونەکان خاوەنی نەفس‌و عەقڵن ، وە ژیانی سەر زەوی هەر ئەوان دەیبەن بە ڕێوە .

وە هەندێ لە مانیش پتر تیادا ڕۆ دەچن ، دەزیاتر لە سنووروو پاسای عەقڵ لا ئەدەن‌و ئەڵێن  نەك هەر ئاسمانەکان بەڵکوو تێکڕا گەردوون بە ئاسمانەکانەوە وە بە ئەستێرەکانەوە وە لە گەڵ کۆمەڵەی خۆردا خاوەنی عەقڵ‌و بیستن‌و بینینن ، بەڵام چەژتن‌و بۆنیان نییە .

بە ڕاستی هەر کەسێ کەمێکی کەم هۆش‌و گۆشی بێ ئەزانێ کە ئەم داوایە بەتاڵەو دورە لە ڕاستییەوە وە

ڕاستییەکەی ئەمەیە   کە گەردوون بە گشتی ئەمەقڵو بیستنو بینینیان هەیەو ، نە بەدیهێنەری ژیانو مردنو نەکار گوزاری سەرزەویان پێ دەکرێت ، بەڵکوو لاشەو قەوارەیەکی بێ گیانو هەرگیز ئارەزووویستیان بە دەست خۆیان نییە ، جگە لەمە کە وەك ئامێرێکی گەلێ بە کەڵك خوای گەورە دروستی کردوون بۆ سوودو بەرژەوەندی ئادەمیزادو هیچی تر دەسەڵاتو توانایان نییە ٠

جا لە بەر

ئەوەی بێ باوەڕەکان گوێ بۆ قورئـــان ناگرنو لەواتاوو ڕەوانبێژیو نهێنییەکانی ناگەن ، وە داوای بەڵگەی عەقلی ئەکەن ، پێویستە ئێمەش بە بەلگەی عەقلی وەڵامیان بدەینەوە ، جا دەڵێین هەر خوای تەنهایە کەبوونەوەری لە نەبوونەوە بەدیهێناوە ، ئەو خوایە کە ( واجب )و پێویستە بوونی ، وە هەرگیز ئەو پێویستی بە کەس نییە ، چونکە ئەگەر ( جائیز )و دروست بێ بوونیو بەس ئەوە ئەو کاتە لە ڕیزی بوونەوەرا دائەنرێ ، کەواتە نابێ بە بەدیهێنەری بوونەوەر ، لە گەڵ ئەمەشدا ئەم بوونەوەرە بە گشتی هەر لە گەردیلە یەکەوە تا عەرش کە گەورەترین دروست کاری خوایە تێکڕا بەلگەیە لە سەر بوونی خواو نیشانەیە لە سەر بەدیهێنەرێکی بە توانا ، وە لەم ووتەیەی ئێمەوە نزیکە کە بگووترێ بەدیهێنەری هەر چیی ( مومکین ) هەیە پێویستە هەر خوا بێ کە سیفەتی وایە پێویستو ( واجب )ە بوونی ، چونکە ئەگەر بوونی پێویستو ( واجب ) نەبێ ئەبێ ( مومکین )وگونجاو بێ ئەوە ئەوو کاتە ئەچێتە ڕیزی بوونەوەرەوە ، خۆ ئەگەر یەکێ بێ لە ڕیزی بوونەوەردا ئاشکرایە نابێتە بەدیهێنەری بوونەوەر ، جا بۆ وێنە ئەگەر بێتو زنجیرەێ ڕیزکەین بە فەرزی مەحاڵ بلێین تۆ

کوڕەکەی خۆتت دروست کردووە ، وە تۆش باوکت دروستی کردووی . وە هەتا دوایی تاتەکاتە ئادەم ، جا ئەگەر ئادەم ئەوەکانی دروست کردبێ ئەبێ کێ ئادەمی دروست کردبێ ، ؟ لێرەدا دەور ڕوو ئەدات ، وە دەوریش ئەگونجاو مەحالە کەواتە ئەبێ یەکێ ئەم بوونەوەرەی پەدیی هێنابێ کە لە ڕیزی بوونەوەردانەبێ کە ئەویش خوای پەدیهێنەری بوونەوەرە وە دروستیش نییە کە هەر خۆی خۆیی پەدیهێنابێ ، چونکە ئەگەر لە پێشا نەبووبێ چۆن دروست شتێ کە نەبێ ببێتە پەدیهێنەر ، وە مەحالیشە ئەو پەدیهێنەرە لە یەك کاتی دیارپەدابووبێ و نەبووبێ وەناشبێ کە نیوەی خۆی خۆیی دروست کردبێ و نیوەکەی کەشی بوونەوەر وە پێویستە ئەو پەدیهێنەرە لە ڕیزی ( مومکین )ی نەبووندا نەبێ و لە مانە بەدەر بێ وە ئەبێ هەمیشە ( واجب )ی پێویست بێ بوونی ، کە ئەویش هەر خوای تەنهایە ، وە بەم جۆرە زنجیرەکە ئەبچڕێ و ڕزگارمان ئەبێ لە ئەڵقەو زنجیرە واتە لە دەوروو تەسەلسول وە بەم جۆرە بەتاڵ ئەبێتەوە ، یا ئەگەر بێت و بە بەڵگەی بەراورد بەراوردی بکەین بەم ڕەنگە فەرزکەین لە کوڕەکەی تۆوە دەست پێ بکەین و زنجیرەی ڕیزبکەین تا ئەکاتە ئادەم وە لە کوڕە زاکەی منیشەوە هەر هەمان زنجیرە ڕیك بخەین ، تا ئەکاتە ئادەم وەك ئەم وێنەیەی لای خوارەوە وە لە ئەوەلی هەر دووریزەکەوە بە یەکەم حاڵ دەست پێ دەکەین ، وە یەکە یەکە بەراوردی ئەکەین و دەڵێین ئەمە تۆەی دروست

وەك ئەم وێنەیە :-



کردوه وه ئەمەش ئەوەی دروست کردووه هەتا کۆتایی دێ ، جا ئەگەر ئەم دوو زنجیرەیە هەر پرواو دوایی نەیەت ئەوە ئەوکاتە ئەبێ ناقیص وەکووزائید وەهایی‌و یەکسان بێ خۆ ئەمەش مەحالە ، وە ئەگەر ڕیزی یەکەم تەواوبوو لە بەرانبەرەکەیدا خاڵی بوو ئەوە ئاشکرایە کەڕیزی یەکەم کۆتایی هاتوە ، وە ڕیزی دوەمیش ژمارەیەکی دیباری کراوی لە ڕیزی یەکەم زیاترە ، خۆ ئەمەش ئاشکرایە ژمارەیەکی زیادەو بەئەندازەیەکی دیاری کراوو ئەویش ئاشکراوو ڕونە هەرکۆتایی دێ ، چونکە ژمارەیەکی دیباری لە ڕیزی یەکەم زیاترە ٠ کەواتە بۆمان ڕون بووەوە بە بەڵگەی بەراورد کە هەر خوایە بەدیهێنەر وە هەر ئەو شایستەی خوایەتییە[1] ٠

ئەگەر بێت‌و بەووردی لە ڕێو ڕێبازی بێ باوەڕەکانی جیهان بکۆلینەوە بۆمان ڕون دەبێتەوە کە دژایەتییەکی زۆر بە هێز لە نێواندا هەیەو ، هەتا کۆمەڵو تاقمێکیان ڕاوو ڕێبازی ئەوی کەیان بەتاڵ ئەکەنەوە ، وە لە ئەنجامی کاردا لە نوختەی سفردا یەکتر دەگرنەوە ، وەکو : چەند نمونەیەکمان لە پێشەوە ڕابووارد ، یا وەکو زانایانی گەردون ناسیی‌بە زانایانی سروشت دەڵین : گەردون خاوەنی هەڵ‌و بیرن‌و ئەبیسن‌و ئەبینن‌و هەر خۆیان کار گوزاری مردن‌و ژینی سەر زەوین ٠

کەچی لەم لاشەوە سروشت ناسەکان دەڵێن نێوە بە هەڵەدا چون کە دەڵێن فەلەکەکان کار گوزاری زەوی‌ە هەوی مردن‌و ژین بەلکو ئەم بوونەوەرە بە ڕێکەوت پەیدابووە ، وە

---

1 ــ العقائد النسفية ٠

سروشت بە هۆی لە یەك کەوتن و لە یەك خشان و هەواو گەرمی و ساردی مەناخ زیندوەر دێنێتە بەرهەم ·

لێرەدا لە جێگای خۆیدایە کە ئادەمیزادی عاقل و زیر بڵێ مادام ئێوە کە یەکترتان بە درۆخستەوە هەردوکتان درۆزنن و باوەڕم بە قسەکانتان نییە ، وە بۆم دەرکەووت کە هەرخوای بە دی هێنەری جیهانە کە مردن و ژینی بەدەستە ، وە ئەم بوونەوەرە بە گشتیی جوانکاری ئەو کارجووانەیە ·

لەم چەرخی بیستەمەدا کە زانیاری و پیشەسازی لە جاران زیاتر پێش کەوتووتر بووە ، وە هەموو دانیشتووانی سەر زەوی شانازی بە پێش کەوتن و زانیاری و پەرەسەندنەوە ئەکەن ، کە چی هەندێ کەس وەك کابرای لەمەڕ بە نەزانینەوە خۆیان هەڵئەکێشن و ، فەلسەفە ، ئەکەن و وەها گومان ئەبەن کە بێ باوەڕیی و دەمارگری و گومڕای و لەسنوری یاسای ئیسلام لادان فەلسەفەیەو حیکمەتە ، کە چی ئاگای لە ڕای فیساگۆرسی[1] ·

فەیلەسوف نییە کە مامۆستای فەیلەسوفەکانی جیهانە کاتێ دەڵێ : فەلسەفە بە مانا زانیاری ( حیکمە )تە وە حەکیمی

---

1 ــ فەلسەفە لە بنەڕەتدا ووشەیەکی یونانییە ، وە پێك هاتووە لە دوو ووشە ، فەیل ــ واتە : خۆشەویست ، سۆفیا حیکمەت و زانیاری ، وە یەکەم کەس کە ووشەی فەلسەفەی داهێناوە فیاغۆرسی یۆنانی بووە ، کە لە سەدەی شەشی پێش عیسادا ژیاوە ، دائرة المعارف محمد فرید وجدی لاپەرە ــ ٤٠٤ ــ بەرگی ٧ ·

بە ڕاستی هەر خوای بەرزوو بێ هاوتایە ، وە ئەگەر نیسبەتو پەیوەندی حیکمەت بەرین بۆلای بەندەکانی ناڕاستەو لە جێگای خۆیدانییە ، جگە لەوە کەمرۆڤ بۆی هەیە حیکمەتی خۆش بوێتو هەوڵی بۆبدا کە فێری بێ ٠

کەواتە با فەرمودەیەکی ئەو پەروەردگارە حەکیمە بخوێنینەوەو بە وردی لە ماناوو نهێنیەکانی بگەین ، وجا بە دڵێکی فراوانی پڕ لە ویژدانەوە حوکمی نەفسی خۆمان بدەین ٠

( وآية لهم الليلُ نسلخ منه النهارَ فاذاهم مظلمون ، والشمس تجرى لمستقرٍ لها ذلك تقديرُ العزيز العليم ، والقمر قدّرناه منازل حتى عادَ كالعرجون القديم لا الشمسُ ينبغي لها ان تدركَ القمر ولا الليلُ سابق النهارِ وكلٌ في فلكٍ يسبحون )[1] ٠

واتە بەڵگەیەکی بە هێز بۆدەسەڵاتو توانایی ئەوو پەروەردگارە ئەمەیە کە پێستی سپی‌و ڕوناکی ڕۆژی لە شەوی تاریك دادەڕنێ،وە جارێ تاریك دادێو ئەکەوینە شەوی تاریکەوە هەر وەها ئەوڕۆژە کە ئێوە ئەیبینن هەمیشە بە ڕێگای خۆیدا هاتو چۆ دەکات تاکۆتایی ی جیهان ، وە ئەمەیش بە گوێرەی ویستی خودایە ٠

وە مانگیشمان گێڕاوە بە پلەو پایەی جیا جیا بەم جۆرە یەکەم شەوو بە ئەندازەی دەمە داسێك لە ئێمەوە دیارە ، وە شەوو لە دوای شەوو بەرەو زیادی دەڕوا تا شەوی چواردە کە بە تەواوی پڕ دەبێتەوە ، جا بەرە بەرە کەم دەکاتو تا لە

---

[1] سورة يس ٠

کۆتایی مانگدا شەوێ وون دەبێ ، وە دووبارە لە سەرەتای مانگی تازەوە وەکو لقە خورمایەکی کۆنی چەماوە خۆی دەنوێنێ ·

وە ئەڕۆژ بە سی یا بیستو نۆ ڕۆژ ئەگاتە مانگ لە تیژ ڕەویدا بەم جۆرە چەرخەی خۆی تەواوبکا ، نە مانگیش ئەتوانێ بکا بە ڕۆژ لە سێتی ڕەویدا بەم جۆرە بە سالێ چەرخەیەک تەواوو بکا ، وە بە مانایەکی تر نە ئەوو ئەتوانێ پێش ڕۆژ بکەوێ بەم ڕەنگە نەهێلی ڕۆژ بێتەدی ، وەهەر یەکە لە مانگ و ڕۆژو باقی ئەستێرەکانی تر لە سنوورو میحوەری خۆیاندا دەگەڕێن وە لە مەداروولەلەکی خۆیاندا تیپەڕ ناکەن ·

پرسیار ؟ ئاشکرایە خوا لە هەموو شتێکدا هێزی جازیبیەی تیادا خەلق کردووە ، وە ئەگەر ئەو هێزە نەمێنی ئەم زەوییە لە سەر ڕای نیوتن و گالیلۆ پارچە پارچە ئەبێ و ئەتەقێتەوە وەک پوشکە با ئەیباتو ، بە هیچ جورێ ژیان نامێنێ ، ئایا ئەوهێزە بە هێزە نهێنیە چی یە وچۆن پەیدا بووە ؟ تکایە پێناسەی بکە ئیترچاوەڕێی وەلامین ·

## ( پووختەی ڕێبازی داروێن )

بەڵێ خوێنەری بەڕێز وەنەبێ داروێنو لامارک نەزانو جاهیل بووبن ، وانییە : بەڵکو زانابوون وەتاقی کاریو بەراووردییان زۆر یەدی هێناوە ، وە لە ڕیزی زاناکانی جیهاندا جێ پێی خۆیان کردۆتەوە ، وەهاش نییە کە هەر ئەوان

زاناپوو بن‌و کەسی تر هیچی نەزانیین، وەک هەندێ وای بۆ دەچن، وە ڕاستەو خۆ بۆپەرەپێدان‌و گەشە کردنی عیلم‌و زانیاری گەلێ هەوڵیان داوەو خزمەتی زانستیان زۆر کردووە ، ئەمـــە لـــەم ڕووەوە پەسەندەو جێگەی ڕێزە ٠

بەڵام لەلایەکی کەشەوە گەلێ زیانیان گەیاندووە بەکۆمەڵی ئادەمیزاد ، بۆ وێنە : باوەڕی گـەلێ کەسیـان تێـکداوە ، وە ڕێگەی ڕاستیان لە گەلێ کەس بەر بەست کـردووە ، وە گەلـێ کەسیان توشی نەخۆشی دەروونی کردووە وێڕای ئەمانەش هێنایان مرۆڤیان لە پلەی مرۆڤایەتی داڕنی‌و بەرگی مەیمونیان کرد بە بەریاو وە لە نزمترین پلەی زیندەوەرا دایانان، ئادەمیزادیان هێناو لە ئەوەی پێغەمەرایەتی شۆردیانەوە وەچنی قوڕی ڕەشییان دایە سەرو گوێلاکیاو لە ڕیزی زیندەوەراندا ڕیزیان کردن بە بێ جیاوازی ، وە ڕایان گەیاند کە ئادەمیـــزاد ئەوەی ئادەم‌نییە ، بەڵکوو چەند کرمێ بوون لە هەوەڵەوە وە لـە گـەنکاوەکـاندا سروشت دروستی کردوون ، وە ئەم گیانەوەرانە بەرە بەرە گەورە بوون تا بە ئەندازەی بۆقێکیان لێ‌هاتووە ، جا بەرە بەرە گەورە بوون تا بوون بەم مەیمونەی ئیستا کە بە باوەڕی ئەوان باوکە گەورەی مرۆڤ‌و ئینسـاتی زیرن ٠

جا ئێمەش ئەوڕاوو بۆچوونەیان دەخەینەڕوو ، بۆ ئەوەی بزانین تا چی ڕادەیەک پەسەندە یا نا پەسەندە بەلای زاناکانەوە ، وە پوختەی ئەم ڕێبازە بریتیە لەم چوار خالەسەرەکییە ٠

١ ــ یەکەم زۆران بازی بۆمانەوە ، ( الصـراع من اجل البقاء )

واتە : چی گیان لەبەری زەوی هەیە بەر بەرەکانێو زۆران بازی ئەکەن بۆ مانەوە ٠

٢ ــ دووەم یاســـای هەڵبژاردنــی سروشــتی ( الانتخـاب الطبیعی ) واتە بەهــۆی هەڵبژاردنــەوە سروشــت بــە هێزترو چاکتر لە ناوزیندەوەرانــدا دەهێنێتەوەو چــی بێهێزو لاوازو خراپە لە نــاوی دەباودەیفەوتێنــێ وە بەم ڕەنگە گیان لەبەرانو ڕووەك گەشە دەکەن ٠

٣ ــ سێیەم : بە هۆی جۆروو ڕەنگی خواردنەوە جۆروو ڕەنگی گیانەوەرو ڕووەك دەگۆڕێ ، خۆ سازاندن لە گەڵ دەورو بەردا ، ( الملائمة مع البیئة ) ٠

٤ ــ چوارەم : بە هۆی چۆنیەتی سیفەتی پەیدابووەوە لە دایكو باوكدا ئــەو سیفەتە ئەگوێزرێتــەوە بۆ وەچەکانی پاش خۆیان ، یاسای بنەماو بازدان ( الوراثة والطفرة )[1] ٠

جا لێرەدا زاناکان وەڵامی داروێن ئەدەنەوەو ڕیسەکەیــان ئــەکەنــەوە بــە خــووری بــەم جــۆرە دەڵێــن : یــەکــەم بــە هیــچ ڕەنگــێ گەشــە کــردن لــە هیــچ جۆرێکـــی زیندەوەری زەویدا ڕووی نەداوە ، وە لــە هەزارەهــا ساڵ لەوە پێشو تائێستاو لە مەولایش هەر گیز ڕوو نادات ، بەم ڕەنگــە گیان لە بەرێ لە جینسو بنەمای خۆیەوە بچێت بۆ بنەمایەکــی تر ، وانیە هەرگیز مێشە ڕەشە نابێ بە مێش هەنگوین ٠

٢ ــ دووەم : مرۆڤو مەیموون زنجیرەیەك نییەکە بیان گەیەنێ بە یەکێ وەك بڵێن : مەیمونێ هەبێ پلەیەك لــە جینســی مەیمون بەرزتر بێو پلەیەکیش لە مرۆڤ کەمتر ٠

١ ــ دائرة المعارف ، محمد فرید وجدی ٠

٢ ـ سێیەم   ئەم ڕۆژگارە دوورو درێژە داخورازی گەشە کردنو بەرزبوونەوە دەکات وە لە گەڵ ئەمەشدا هیچ جۆرە گیان لە بەرێ لە ئەصڵو بنەمای خۆی جیا نەبووەتەوە بۆ وێنە پیرەژن ( اسد النمل ) لە پێش هەزارەها ساڵدا تا ئیستاهەر خۆڵەکا بەخۆیداو تەڵە بۆ مێرولە دەنێتەوەو دەیخووا[1] .

٣ ـ چوارەم : بە هیچ جۆرێ هەموو سیفەتەکانی باوکو دایك ڕاناگوێزرێ بۆ نەوەکانی وە ئەگەرسیفەتێ یاچەند سیفەتی لە ئەومدا بێتە جێ نابێتە بەڵگە بۆ داروینو پشتی پێ نابەسرێ چونکە بەتالی بەشێ لە (گوڵ) بەتالی گشتە وە لەم ڕووەوە طەنطاوی لە تەفسیرەکەیدا دەڵێ سوروشتی دامەزراوو موحکەم لەو ئایەتانە دەچێ کە موحکەمو دامەزراوە وە هەر گیز گۆڕینی بە سەردا نایەت کە ئەویش نیگای خودایە کە قورئانە ، جا لێرەدا زیندەوەرێکی تر دەهێنینو ئەیکەن بە وێنە کە بەهەرەیی ئەبوودەقیتی پێ دەڵێن : کە ( جۆستاف چۆلییە ) پزیشکی لێ هاتوو دەڵێ ، ئەگەر

---

١ ـ پیرەژن ( یا اسد النمل ) زیندەوەرێکە بە ئەندازەی مێشە ڕەشەیەکە ، لە خۆڵی وردی ساڵدا چاڵێکی بچوك ئەکا کەقوڵییەکەی گرێپەنجەیەکە ، ئەم چاڵە لە سەرەوە بڵاوەو لەبنەوە تەسکە ، بە شێوەیێ دروستی کردووە هەر جێگایی خۆیی تیادەبێتەوە ، ئەم پیرە ژنە لەبنی چاڵەکەدا هەردوو قاچو هەردوو دەستی بەرەو ژور دەکاتەوە و خۆی ئەشارێتەوە ، جا هەر مێرولەێ

لەم گیانەوەرە بچوکە وورد بینەوە ئەبینن ، بـە هەموو هێـزو توانایەکیەوە هاوار ئەکاتە دانیشتووانـی سـەر زەوی ، کـە ڕێبازی داروینو لامارك بەتاڵەو ، گەشە کردنو پەرز بوونەوە هەیئە ، وە ئەم گیانەوەرە هەزارەها سـاڵ تەمەنـی درێـژە ، وەبەڵکوو هەر لە ژمارە نایەت کە چی هیچ جـۆرە گەشەیەکـو گۆڕانێکی بەسەردا نەهاتووە ، وە لەم ڕایەدا نزیکەی بیست زانا لە گەورە زانایانی ( مووروشت ) جۆلۆجییاو زەوی ناسـەکانو گەلێکی تر بڕیاریان لە سەر داوەو مۆریان پیادا ناوە[2] ۰

وە ئەگەر ئادەمیزاد لە چەند لایەنێکی دیـاری کـراوەوە گەشەی بە خۆیەوە بینیبێ لە زۆر لایەنەوە دووا کەوتووەو لـە کاروان بەجێ ماوەو گەلێ پلەدابەزیوە وەکو : ڕوونو ئاشکرایە قورئانو حەدیسو مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە ، کە ئادەمیـزادی کۆن گەلێ تەمەن درێژترو لەشـو لاریـان لە ئێمـە ئەسـتور ترو باڵابەرزتر بوون، بۆ وێنە ئادەم پێنجەمەر هەزار ساڵ تەمەنی

---

بێتە لێواری چاڵەکە چوونکی ساڵە ئەخزێو ئەکەوێتە خوارەوە ، جا پیرە ژن دەیگرێو ئەیمژێو ئەوو جا دەیخوات ، وە بەم جۆ دیـسـان چاڵـێکی تر ئەکـات ( تفسير الجواهر ) ۰

١ ــ بروانە لاپەڕە ــ ٥٠ ــ بەرگی دوو تەفسیر الجواهـر طنطاوی ۰

درێژبووە وە حەزرەتی نووح ( ٩٥٠ ) نۆسەدوو پەنجا ساڵ لە ناو قەومەکەیدا دەعوەتی کردووە ، هەتا سەدە لە دوای سەدە ئادەمیزاد تەمەنی کورتتر دەبێ ، لە گەڵ ئەم هەموو خواردن و خواردنەوەو ئارایشتەداو لە گەڵ ئەم هەموو ئامێرو کەرەسەو ڕاهێنانەدا ، کە تەمەن درێژیی بەڵگەیەکی هەرە گەورەیە بۆ تەواوی عەقڵ و هێزوو زانیاریو تەندروستی ، جگە لە مەش زانایەکی ئەڵمانی ڕێبازێکی بە پێچەوانەی ڕێبازی داروێنەوە داناوەو دەڵێ : مەیمون لە ئەسڵا ئادەمیزاد بووە ئەک ئادەمیزاد مەیمون بووبێ و گەشەی کردبێ وە بەڵگەکانی داروێنی هێناوەو کردوویە بە بەڵگە بۆ ڕاستی ڕێبازەکەی خۆی[1] •

وە بەم ڕەنگە تیۆرەکەی داروێنمان بۆ دەرکەووت کە لە ڕاوو بۆ چوونێ بەدەر چیدی نیە ، جا دەڵێین : تیۆرەوو ئەزەرییەکەی داروێن نایێتە بەڵگەی باوەڕ پێ کراوو وە هەر تێ ڕوانین و ئەزەرە •

---

١ ــ قصص الانبیاء عبدالوهاب النجار •
٢ ــ سروشت ناسەکان دەڵێن ئەم جیهانە ڕۆژی دێ کۆتایی پێ هەر وەک گەشە ئەکات ئاوەر ڕادەیە کە پێی ئەگات هەر وەها گەشە ئەکات تا پەرەو ئەمان و لە ناو چوونی حەتمی •

( العقائد الاسلامیة سید سابق لاپەڕە ٢٦٦ )

## ( ڕێبـازی سۆفسطائی )

خوێنەری بەڕێز سـەر چاوەی بیروو باوەڕی بێ باوەڕەکان بە گشتی ئەگەڕێتەوە بۆ یەکەمین دوژمنـی مرۆڤـایەتی ئـەو دوژمنەی کە هەمیشەوو دایم بۆ هەڵو فرسـەت ئەگـەڕێ کـە گوناهوو تاوانمان پێ بکات ئەو دوژمنەی کە ئەیەوێ هاوڕێ بۆ خۆی پەیدا بکات ، ئەو دوژمنەی هەر ئەو دوژمنەیە کە ئادەمو حـەووای هەڵفریـوانو گوناهەکـەی پێکـردنو گەنمەکـەی دەرخواردداو و بە و ڕۆنەیەوە لە بەهەشت دەرکران کە ئەویش شەیتانە ، ئەو شەیتانەی کە بێ بەشو مەئویسە لە ڕەحمو بەزەیی خوا ، جایەکێ لەو کۆڕوو کۆمەڵەی کە شەیتان ڕێگەی ڕاستی لێ تێك داوون سۆفسطایە ، وە ئەو کەسانەشە کە پەڕۆو ڕێبـازی ئەواندا دەڕۆن ، وە ئەم کۆڕەش بوون بە سێ بەشەوە یەکـەم . ئینکاری حەقیقەتی هەموو شتێ ئەکەن وەهـا گومـان ئەبـەنو ئەڵێن : هەموو شتێ خەیاڵاتو واهیمەیـە ، وە ئەمانـە پێیـان ئەووترێ عینادی ، دووەم ئینکارن لـە وەدا نازانن حەقیقەتـی شت هەیە یانییە وە ئینکاری بوون یانەبوونی هیچ شتێ ناکەن ، وە گومان لەوەدا دەکەن کەهان لە گوماندا ، وە ئەمانەش پێیان ئەووترێ ( ﻟ'لا ادری ) ، وە سێیەم : گومان ئەکەنو دەڵێـن . حەقیقەتی هەموو شتێ بە گوێرەی بیروو باوەڕی خاوەنەکەیەتی، لە گەڵ ئەمەشدا دیان بە بوونی هیچ شتێکدا نانێن ، وە ئەمانەش پێیان ئەووترێ ( العندیه ) .

وە ئەم بیروو باوەڕە ڕاستەو خۆ سـەرەکێشـێ بۆ کوفروو حاشا لە بوونی خوا پەنا ئەگرم بە تۆ خوا لە کوفر ، جا زاناکان

وەلامی ئەم گومانە بەم شێوەیە ئەدەنـەوە ، وە بـە و خـاوەن گومانانە دەڵێن : ئەم گوتەیەی ئێوە یاحەقیقەتی هەیە یانا ؟

ئەگەر بڵێن ئەم گوتەیەی ئێمە حەقیقەتی نییە چۆن دروستە داوای شتێ بکەن کە نەبێ ، وە ئەگەر بڵێن ئەم گوتەیەی ئێمــە حەقیقەتی هەیە ئەوە وەکوو ئەوە وایە کە وازتان لە ڕێبازەکەی خۆتان هێنابێ .

ئەگێڕنـەوە پیـاوێ لـە سۆفسطائیەکـان لە گەڵ زاناپەکا ئەکەونە کێشەوە کابرای سۆفسطائی بە هیچ شتـێ قەنـاعەت ناکات ، زاناکە بە پەنامەکی فەرمان ئەدا کە وڵاغەکـەی لـێ بشارنەوە ، دوای ئەم کارە کە پیاوەکە دێتە دەرەوە وڵاخەکەی دیار نییە کابرا دەکەوێتەوەو دەڵێ وڵاخەکەم دزراوە ، زاناکە دەڵێ لەوانەیە بە سواری نەهاتیبی ، کابرا دەڵێ بەڵێ بە سواری هاتم بۆ ئێرە ، زاناکە دەڵێ بیرکەرەوە ، کابرا دەڵێ لەمەدا بێ گومانم ، جا یەك لە سەر یەك لێی دووپـات دەکاتـەوەو دەڵـێ بیرکەرەوە ، هەتا کابرا هاوار ئەکاو دەڵێ بیر لە چی کەمەوە بێ گومانم کە بە وڵاخ هاتووم ، زاناکە دەڵێ ئـەی تـۆ بـە چـی بەڵگەێ دەڵێی شت حەقیقەتی نییەو حاڵی خەوتوو وەکوو حاڵی بە ئاگا وایە لە پاشان کابرا لە ڕاوو ڕێبازەکـەی ئەکەڕێتەوەو پەشیمان ئەبێتەوە .

## ( خەلقی ئادەم )

لە پاش ئەوەی پەروەردگار تێکڕا ئەم بوونەوەرەی بـەم شێوە ڕێك و پێکە دروست کرد ، وەك باسمان کرد لە پێشەوە ، جا ویستی وەهابوو ئادەم پێغەمبەریش خەلق کردو کردی بە جـێ

نشینی سەر زەوی لەبەر ئەوەی ئەم زەوینە بەر بڵاوەی پێ ئاوەدان بکاتەوە ، وە بۆ ئەوەی هەندێ لە گەورەیی‌و دەسەڵاتی خوا بۆ بەندەکانی دەرکەوێ ، وە کەمێ لە نهێنیەکانی ئەو بەدیهێنەرە ئاشکرا بێ ، ئەو پەروەردگارە ویستی هەر کارێ بکا یا ویستی نەمانی هەر شتێ بکا ئەوە لە نێوان کاف‌و نوونداپێك دێ ، وە بە بێ ئەوە هیچ کۆسپێکی بێتە رێ ، وە ئەگەر بێت‌و هەرچی بوونەوەر هەیە کۆبێتەوە بۆ ئەوەی رێگا لە ئالـە فەرمانێکـی بگرن ، هەرگیز نابنە کۆسپ‌و بە هیچ رەنگێ بەرگریان بـۆ ناکرێ ، جا ئەوکارە زەرەرێ یا سوودێ بێ کەپیانەوێ بیگەیەنن بە خوا یا بە یەکێ لە بەندەکانی هیچ جیاوازی نیە ، وە ئەوەندە خوایەکی گەورەیە ئەم بوونەوەرە بـە گشـتی دەسەوسانـەو دەسکەلایە لە بەرابەر هێزی ئـەوودا ، بـەڵام ئـەو هەرگیـز پێویستی بە کەس نیە ٠

جا بەم گفتور گۆ شیرینە کە لە نێوان خواو فریشتەکانیدا بەرپا بوو کە پڕیە لە نهێنی‌و مانای زۆر سەیر ، کـە مرۆ سـەر گەردانە تیایدا وە پەی بە بەیان‌و ماناو رەوانبێژی‌و جوانکاری ئەو نایا پەی ، چیرۆکی ئادەم پێغەمبەر دەستی پێ کرد وەك خوا ئەفەرموێ (وإذ قال ربّك للملئكة إنّي جاعلٌ في الارض خليفة ، قالوا أتجعل فيها من يُفسد فيها ويسفك الدّماءَ ونحن نسبّحُ بحمدك ونقدس لك قال أنّي أعلم مالا تَعلمون )[1]

واتە کـاتێ خـوای تـۆ ئـەی پێغەمـەر فەرمـودی بـە مەلائیکەتەکانی : من ئەمەوێ ئادەم خەلق بکەم‌و بیکەم بە جێ

١ ــ سورتی ( البقرة ) ئایەتی ــ ٣٠ ــ

نشینی سەر زەووی ، وە بە ئادەمیزاد زەووین ئاوەدان کە مەوە ، جا فریشتەکان ئەم کارەی خوایان پەلاوە سەیروو نهێنی بوو ، لە بەر ئەوە داوایان لە خوا کرد تەك بە شێوەی ڕەخنە کە ئـــەم هۆیە یا ئەم نهێنیەیان بۆ ڕوون بکاتەوە ، داوای فریشتەکان وەك داواکەی حەزرەتی ئیبراهیم وەهابوو ، کاتێ کە داوای لە خوا کرد کە پیشانی بدا چۆن مردوو زیندوو ئەبێتـەوە ، لـە گـەڵ ئەمەشدا حەزرەتی ئیبراهیم باوەڕی بە زیندوو بوونەوە هەبوو، مەلائیکەکان ووتیان ئەی خوایە ئایا کەسانێ ئەکەیتە جێ نشینی زەووی کە گوناهوو فەسادی بکەن کە خوێنی ناحـەق بڕێـژن‌و کاری ناپەسەند بکەن ، وە ئێمە هەمیشەوو دایم زیکروو یادی تۆ ئەکەینەوە ، وە ئێمە تەسبیحـاتو ستایشـی تۆ دەکـەین ، وە ڕێزوو تەقدیسی تۆدەگرین‌و ، کەچی ئادەمیزاد ئەکەیتە جـــێ نشین ، خوا لە وەڵامدا فەرمووی بە ڕاستی ئەوەی من دەیزانم لە ئێوە نهێنیەوو نایزانن ٠

لە پاش ئەمە : خوای گەورە فەرمووی ئەی عەزرائیل بڕۆ بۆ سەر زەووی‌و هەندێ خاك هەڵ گرەوو وەرەوە ، عەزرائیـل فەرمانی خوای بە جێ هێنا دەست بە جێ چوو هەمووی هێنا ، جا پەروەردگار بە دەستی قودرەتی خۆی گلێنەی ئادەمی لەو خاکـە دروست کرد ، لە پاش ئەمە ماوەێ کە هەر خوا ئەزانێ چەنـدە لە شێوەی قەوارەیەکی گلیندا مایـەوە وەك خـوا لە قورئانـا ئەفەرمووێ ( هل أتى على الانسان[1] حين من الدّهر لم يكـن

شیئاً مذکورا )[1] واته : ئایا چەند کات و زەمانێ ئەهات بە سەر
ھەیکەلو گلینەی ئادەمدا کە شتێکی ئەو تۆ نەبوو ھەر ناویشی
بیرێ و باسی لێوە بکرێ ،؟ بەلێ بە ڕاستی ئەو زەمانە ھات ٠

ئەگێڕنەوە لە نبین و عەبباسەوە ، کــە فەرمووبەتــی ئادەم
ماوەی چل سال قوڕ بووە ، چل سال سوالەت بووە ، وە چل سال
ڕەنگی ئەو سوالەتە ڕەش بووە ، ئەوجا شێوەی ئادەمی کراوە بە
بەردا ، وە لە دوای سەدوو بیــست سال خەلقی تەواو بوو وە لــە
پاش ئەمە کە وێنەی ئادەم بە دەستی قودرەتی خوا نەخشە کێشرا

ئەوجا لە لایەن خواوە گیــان کــرا بــە بــەریا وەك خــوا
ئەفەرموێ ( إذ قال ربّك للملئكة أنی خالق بشراً من طین فاذا
سوّیته ونفخت فیه من روحی فقعوا له ساجدین فسجد الملئكــة
کلهم اجمعون الاّ ابلیس استکبر وکان من الکافرین )واته
کاتێ کە خوای تۆ ئەی پێغەمەر فەرمووی بە مەلائیکەکانی بــە
ڕاستی من ئەمەوێ ئادەم لە قوڕ خەلق بکەم ، جا پێداربن کاتــێ
کە خەلقی تەواو بوو ئەندامەکانیم ڕێك و پێك کردوو گیانم کرد
بە بەریا ، جا ئێوە کوڕنوشی بەرنە بەروو ڕێزی تەواوی لــێ
بگرن جا فریشتەکان بە جارێ ھەموویــان کوڕنوشیــان بردوو
فەرمانی خوایان بە جێ ھێنا ، جگە لە شەیتان کە خۆی بە زل
گرت وە پەیوەندی زولمی دایــە لای خوا ، وە لە بەر ئەمە چووە

---

١ ــ سورەتی ئینسان ئایەتی ــ ٢ ــ = لە واتای ( حین )دا
دوو ڕا ھەیە : یەکەم بە زەمانێکی نەبڕاوە ئەووترێ ،
دووەم : بە ماوەی چل سال دادەنرێ = تەفسیری کەبیر
لاپەڕە ــ ٢٣٥ ــ امام الرازی ٠

ڕیزی کافرەکانەوە وە خوا تەوقی لەعنەتی لێ کردو ، لە بەزەیی و ڕەحمی بێ بەشی کرد ، وە لە ڕوناکی ئەم ئایەتەوە بۆمان ڕوون ئەبێتەوە کە خوا زۆری ڕێز لە ئادەم گرتوو بەخششی یەکجـــار گرنگەو نازوو نیعمەتی بە سوودی پێ بەخشی ، کە هەر گیــز لە ژمارە نایەن ، وە لە هەموویان گرنگ تر ئەمانـــەن : یەکــەم خوا بە دەستی قودرەتی دروستی کرد ، دووەم : ڕۆحی کرد بــە بەریا ، سێیــەم فەرمانیــدا بــە فریشتەکانی کە کوڕنووشی ڕێز بەرنە بەری ، چوارەم : ناوی هەموو شتێــکی فێــر کــرد ، پێنجەم : لە بەهەشتدا جێ نشین بوو ، شەشەم : حەووای لـــە پەراسووی چەپی خەڵــق کــرد ، حەوتــەم لــە دوای هاتنــە خوارەوەیان لە بەهشت خوا تەوبەی لێ وەرگرت ، هەشتەم : خوا بە ئادەم سەرزەوی ئاوەدان کردەوە ، نۆیەم : خوا کردی بـــە پێغەمەر ، دەیەم : پێغەمەران ئەوەی ئەوون ، یازدەهەم : تەمەنی هەزارساڵ درێژ بووە ، وە هەندێ دەڵێن هەزاروو دوو ســـەد ساڵ بووە دوازدەهەم : خاوەنی گەڵێ موعجیزەی بــەرز بووە ، سیازدەهەم : خوا بە بێ ڕابەر گفتوو گــۆی لە گــەڵ کردووە ، چواردەهەم : لە پێش هەموو پێغەمەرانــدا پێغەمــەر بــووە ، پانزەهەم : نووری فەخری عالەم لە پشتی پیرۆزی ئەو ئاشکرا بووە .

پێغەمەری ئیسلام لە ماناى ئەو ئایەتەدا کــە ڕاســان بوارد ئەفەرمووێ ( أنّ الله خلق آدم من قبضة قبضها مــن جميــع الأرض فجاء بنوا آدم على قدر الأرض جاء منهم الأحمر والأبيض والأسوَد وبين ذلك ، والسَّهْلَ والحزن والخبث والطّيب وبين ذلك )واتە : بە ڕاستی خوا ئادەمی خەلق کرد لە ئەندازەێ خاك .

لە هەر حەووت تەبەقاتی زەووی ، لە بەر ئەوە کە خاك هەمە ڕەنگە وە ئادەمیش لە خاکە نەوەکانیشی وەك ڕەنگی زەووی هاتوونەتە جیهانەوە ، وە ڕەنگی خاکیان وەرگرتووە ٠

جا هەندێ لە ئادەمیزاد سوورەو هەندێ سپییەو هەندێ تر ڕەشەوو هەندێ میانەیە ، وە هەندێ ڕوو خۆشەوو هەندێ ڕوو گرژەوو هەندێ خراپەوو هەندێ چاکەوو هەندێ میانەیە ٠

## ( شەیتان لەعنەتی لێ کرا )

لە پاش خەلقی ئادەم تێکڕا فریشتەکان فەرمانی خوایان بەجێ هێناوو کوڕنووشیان بردە بەر ئادەم جگە لە شەیتان کە سەر پێچی فەرمانی خوای کرد وە خوایش لە ڕەحم و بەزەیی خۆی بێ بەشی کردوو ، لە بەهەشت دەری کرد وەك خوا ئەفەرمووێ ( وأذ قلنا للملئكة اسجدوا لأدم فسجدوا الا أبليس ) ٠

واتە کاتێ کە ئێمە فەرمانماندا بە فریشتەکان کە سڵاو بکەن لە ئادەم و ڕێزی لێ بگرن و کەچی بۆ بکەن ، جا بێ سێ و دوو فریشتەکان فەرمانبەرداریان کردوو مل کەچ بوون ، جگە لە شەیتان کە سەر پێچی کردوو لە فەرمانی خوا دەرچوو ، وەك خوا بۆمان ئەگێڕێتەوەو ئەفەرمووێ ( أأسجدُ لمن خلقتَ طيناً )واتە : شەیتان بە شێوەی ڕەخنە گوتی ئایا من کوڕنووش بەرم بۆ کەسێ کە تۆ لە قوڕ دروستت کردووە ، کە قوڕ مادەیەکی تاریك و زوڵمانیە ، خوا ئەفەرموێ ( أرأيتك هذ الذي كرَّمتَ عليَّ لئن أخرتني الى يوم القيامة لاحتنكنَّ ذريتهُ إلاَّ قليلاً ) جا شەیتان لە وەڵامی خوادا دەڵێ : ئایا من چۆن کوڕنووش بەرم بۆ کەسێ کە تۆ بە دەستی خۆت لە قوڕ دروستت کردووە وە من لەو

بەرێز ترم چونکە من لە ئاگرم کە ماددەیەکی نورانیو ڕوناکییە، ئادەم لە خاکە کە تاریکیو زولمانییە ، وە شەیتان بە چاوێکی سووک تەماشای ئادەمی کردو ، گوتی خوایە ئەگەر مۆڵەتت بدامایەو تەمەنم درێژ بوایە تا ڕۆژی دوایی مەرج بێ ئادەمو نەوەکانیشیم لە ڕێگەی ڕاست لابردایەن ، وە بە هێزی ئارەزووی حەیوانییەوە سەر گەردانم بکردنایەو ، تامی گوناهم لاشیرین بکردنایە وە هانم ئەدان کە زۆرودو ستەم لە یەکتر بکەن وە خوێنی بە ناحەق بڕێژن ، وە هانم ئەدان کە لەیبەتو بوهتانی یەکتر بکەن جگە لە بەندە تایبەتیەکانت وە کەمێکی کەم نەبێ کە خۆت یارمەتیان ئەدەیتو ئەیانپارێزی ، خوا لە وەلامدا ئەفەرموێ ( قال أذهب فمن تبعك منهم فأن جهنّم جزاءكم جزاءً موفورا وا'ستفزز مَنِ ا'ستطعت منهم بصوتك وأجلب عليهم بخيلك ورجلك وشاركهم في الأموال والأولاد وعدهم وما يعدهم الشيطان إلا غرورا ً إنَ عبادى ليس لك عليهم سلطان وكفى بربّك وكيلاً )[1]

جا خوا بە هەڕەشەوە فەرمووی بڕۆ شەیتان ئەوا لە بەزەیی خۆم بێ بەشم کردی وە مۆڵەت بە تا ڕۆژی دوایی ، وە چیت لە توانادا هەیە ئەنجامی بدە وەلێ کە ئەم ڕێگایەت بۆ خۆت هەڵبژاردوو داوات لێ کردم . جا هەر کەسێ لە نەوەی ئادەم دوای ڕەووشی بەدی تۆ بکەوێ ئەوە دوزەخ ئەکەمە پاداشتی تۆو ئەوان ، کە ئەمەش باشترین پاداشتە بۆ ئێوەی یاخی بوو هەر وەها خوا لە هەڕەشەکەیدا ئەفەرموێ : ئەگەر لە توانانا هەیە

---

١ ـ سورەتی ( أسراء ) ئایەتی ـ ٦١ ـ ٦٥ =

بەندەکانم لە ڕێگەی ڕاست لادە وە گوناهو خراپەیان پێ بکە وە بە هەموو هێزوو کەرەسەی شەڕانیتەوە کۆشش بکە ، بۆ ئەوەی ڕێگەیان لێ تێك بدەی وە هاوکاریان بکەوو هانیان بدە بۆ کاسبی مالی حەرامو زۆروو ستەم وە پییان بە بۆ کردەوەی ناپەسەندوو کاری گوناهو ناشکوری نازوو نیعمەتی خوا بە منداڵەکانیان بکە ، وە هەتیان تێ لە سەر فەسادوو ڕایان بێنە لە سەر درۆو دەلەسەوو پەیمان شکاندن ، وەلێ ئەگەر ئەوپەتدانەم ئەم کارانەیان ئەنجام گەیاند ئەوانە بەندەی بە ڕاستی من نین ، وە پەیوەندی من لە گەڵ ئەواندا دەپچڕێ ، چونکە بەندەی تایبەتی من هەر گیز شەیتان ناتوانێ لەخشتەی بەرێ ، وە هێز بە سەریدا بکات چونکە ئەوان هەر خوایان کردووە بە پشتو پەنای خۆیان ، وە خوایش هەمیشە یارمەتی دەری ئەوانە ، وە هەر بەندەێ کە خوا یارمەتی دەری بێ هەر گیز لە هەردوو دونیا خار نایەتە ڕێگای ، وە پێویستی بە خوا نەبێ بە کەس نییە .

جا لە بەر ئەم خاڵانەی خوارەوە بوو کە شەیتان لە لایەن خواوە تەوقی لەعنەتی کردە گەردنیو لە بەزەیی خوا بەشی بڕا .

یەکەم : فەرمان بەرداری خوای نەکرد ، دووەم : پەیوەندی زولمی دایە پاڵ خوا ، سێیەم : هەوای کردوو نەفسی خۆی بە زل گرت ، چوارەم : بە چاوی سووك تەماشای ئادەمی کرد ، کە بە دەستی توانایی خوا خەلق بوبوو ، وە هەر ئەم هۆیانەش بوو کە کاری تێ کردوو کوێرنوونی نەبرد -

وە بەم شێوەیەو بەم جۆرە ئاخاوتنە شەیتان لە بەزەیی خوا

دەرکراوە لە بەهەشت بەشی برا ، وە هەر لە بەر ئەمە بوو کە بووە گەورەترینو دووژمن ترینی ئادەمیزاد تاڕۆژی دوایی خوا پەنامان بدات ٠

## ( ئادەم بە زانیاری گۆش کرا )

لە پاش ئەمە کە ئادەم خەڵقی تەواو بوو ، خوای گەورە ناوی هەموو شتێکی فێرکرد وە پێزانی وافیمی هەموو شتێ بوو ، بۆ ئەوەی ئادەمیزادی سەر زەووی بە گشتی سوودی لێ وەرگرن، وە لە بەر ئەوەی ئاشکرابێ بۆ فریشتەکان کە ئەم تازە پەیدابووە کە ئەوان بە تیلەی چاو هێمای بۆ ئەکەنو بەشتێکی ئەووتۆی نازانن زۆر لەوان زاناترەو گەلێ لەوان بە مارىفەتترە ٠

جا خوا فەرمووی ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە تاقیان بکەمەوە ، کە کامتان شایستەی ئەوەن کە بینە جێنشینی زەوی ٠

لە پاش ئەمە خوا چەند ناوێکی لە فریشتەکان پرسی بەڵام نەیانزانیو دۆش دامانو وەڵامیان بۆ نەدرایەوە ، ئەوجا موزریان بۆ خوا هێنایەوە وەگوتیان ئەی پەروەردگار پاکو بێ گەردی هەر بۆتۆیە ، بێ عەیبیو بێ ئەنگی هەر بۆ تۆیە ، وە ئێمە هەر گیز ڕەخنە لە کارەکانت ناگرین ، وە ئێمە هیچ جۆرە زانیارییەکمان نییە جگە لەوە کە تۆ پێمان ئەبەخشیت ، وە هەر تۆ هەموو شتێ ئەزانیو هیچت لێ وون نابێ ، وە حەکیمی بە ڕاستی هەر تۆی ، وە لە هەر کارێکدا کە بتەوێ ئەنجامی بدەی ، وە لە بەر ئەوەی ئادەم ببێتە مامۆستای فریشتەکانو پلەو پایەی بەرزی ئەویان بۆ دەرکەوێ ، خوا فەرمووی کەواتە ئادەم تۆ وەڵام دەوە وە ئەم زانیارییە بە فریشتەکان ڕاگەیەنە ٠

جا لەم کاتەدا ئادەم وەلامـی دایـەوە ، وە نـاوی هەمـوو شتەکانی یەکە یەکە بەیان کرد ، وە پتر فەزلی ئەو بۆ فریشتەکان روون بووەوە ، وەك خوا ئەفەرمـوێ ، ( وعلّم آدم الأسماء کلّها )واتە پەروەردگار زانیاری هاویشتە دڵی ئادەمەوە ، وە ناوی هەموو شتێکی فێر کرد وە ئەوەیشـی کـە لـە ئەرزوو ئاسمانەکاندایە ( ثمّ عرضهم على الملئكة )واتە : لە پاش ئـەم کارانە ئەو شتانـەی راتـوان وە پێشانـی فریشتەکانیـدا ( فقال أنبؤني بأسماء هؤلاء أن كنتم صادقين )[1]واتە خوا فەرمووی بە فریشتەکانی ئاگادارم بکەن بە ناوی ئەم شتانـە ئەگەر راست ئەکەن کە دەڵێن ئێمە بۆ جێ نشینی زەوی لـــە بارترین ، ( قالوا سبحانك لا علم لنا إلا ما علّمتنا انّك أنـت العليم الحكيم )[2] ، فریشتەکان گوتیان ئەی خوا پاکو بێ گەردی هەربۆ تۆیە ئێمە هیچ زانیارییەکمان نیە جگە لەو زانیارییەی کە تۆ فێرمان ئەکەیت ، وە کەس بۆی نییە رەخنە لە کارەکانت بگرێ ، وە هەر تۆ زاناوو حەکیمی بە راستیت ، ( قـال یا آدم انبئهم بأسمائهم ) خوا فەرمووی بە ئادەم تۆ ناوی ئەو شتانە بە فریشتەکان بڵێ ، حەزرەتی ئادەم ئەم کارەی ئەنجام گەیاند ، ( فلمّا أنبئهم بأسمائهم )واتە کاتێ ئادەم ناوی شتەکانی بە فریشتەکان راگەیاندو خەبەری دانێ ، ( قال ألم أقل لکم أنّي أعلم غيب السموات والأرض )واتە : خوا فەرمووی ئایا پێـم نەگوتن کە بە راستی هـەر مـن نهێنیەکـانی ئاسمانەکـانو ئەرزەکان ئەزانم ؟

١ ــ البقرة ، ئایەتی ــ ٣١ ــ
٢ ــ البقرة ، ئایەتی ــ ٣٢ ــ

( واعلم ما تُبدون وما كنتم تكتمون )وە پێ ئەزانم ئەو شتەی کە ئێوە ئاشکرای ئەکەن وە ئەوشتەش کە پەنامەکی ئەکەن هەتا ئاگام لە خەتەرەی دڵتانە ۰

## ( خەلقی حەووا )

لە پاش ئەمە پەروەردگار ئەمری فەرموو بە ئادەم کەبچێتە بەهەشتەوە ، هەندێ لە زانایان بەم جۆرە دەیگێڕنەوە ، کاتێ کە شەیتان لە بەهەشت دەرکرا بە فەرمانی خوا ئادەم لەو بەهەشتەدا جێ گیربوو ، وە ماوەێ کە هەر خوا دەزانێ لە بەهەشتدا بە تەنهایی مایەوە ، وە حیکمەتی خوا بەم ڕەنگە داخوازی کرد خەوی لە ئادەم خست و لە پەراسووی چەپی حەوای دروست کرد ، وە جێگاکەی بە گۆشت پڕکرایەوە ، کاتێ کە بەخەبەر هات سەیری کرد ئافرەتێکی شۆخوو شەنگ لە لای سەریەوە دانیشتووە ۰

پرسیاری لێ کردوو گوتی تۆکێی ؟ گوتی من ئافرەتم گوتی بۆچی خەلق بووی ؟ گوتی بۆ ئەوەی کە ببمە هاوسەرت ، وەك خوا لە قورئانا هێما بۆ ئەم مەبەستە دەکاتو دەفەرمووێ ( اَلّذی خلقکم من نفس واحدةٍ وخلق منها زوجها )واتە : ئێوە مەخلوقێکی ئەوتۆن خوای گەورە لە یەك زاتی تەنها کە ئادەمە دروستی کردوون ، وە هەر لە خودی ئادەم حەوایشی دروست کرد ، وەك خوا ئەفەرمووێ ( وجعل منها زوجها )واتە : هەر لە خودی ئادەم حەوایش خەلق کرا ، وە کێڕامان بە هاوسەرو حەلالی وە بۆ ئەوەی ژیانی ژنو مێردایەتی پێکەوە بگوزەرێنن،

جا ئادەمو حەووا هەردوکیان بە خۆشیو شادییەوە لە بەهەشتدا دەگەڕان ، کەس نەبوو لەوان بەختەوەرتر کەس نەبوو وەك ئەوان غەرقی نازی خوابێ ، چۆن وانییە ، کە خوا لە وەصفی ئەوو بەهەشتەدا بفەرموێ ( فيها ماتشتهيه الانفس وتلذ الأعين )واتە لە بەهەشتدا هەیە ئەوشتەی کە چاوپێی خۆش بێو دڵ ئارەزووی بکات تیایدا هەیە ، جا ئەبێ ئەو بەهەشتە چۆن بەهەشتێ بێ ؟!

بریا ئەو خۆشیە تاسەرروابەو ئێمەش بەم دەردە نەچوباینا ، بە ڕاستی دڵ تەزێنترین بەڵا بۆ ئەوکەسانەیە کە خوایان لێ برەنجێ ، وە لەدوای ئەمە ناخۆشترین بەڵا ئەوەیە لە پێ پلاکەی خۆشییەوە دابەزێ بۆ ناخۆشترین ژیان ، جا با ئەم گوفتارەی خوا بڕنەڤین ، ( ويا ادم اسكن أنت وزوجك الجنّة فكلا من حيث شئتما ولاتقربا هذه الشجرة فتكونا من الظالمين[1])واتە ئەی ئادەم خۆتوو هاوسەرەکەت لەم بەهەشتەدا جێنشین بن جا لە هەرچی ئارەزوو ئەکەن بخۆن وە بخۆنەوە تەنها داری گەنم نەبێ نەکەن هیزە نزیکی بکەوون ، وەلێ لە داری گەنم بخۆن ئێوە ئەچنە ڕیزی ستەم کارانەوە ، وە ستەمکاریش ئەشێ تۆڵەی لێ وەرگیرێتەوە ، جا ئا بەم هەڕەشە ترسناکە کە دڵی خاوەن باوەڕان دەهەژێنێ خوا ئامۆژگاری ئادەمو حەووای کرد هەر وەها خوا ئامۆژگاری ئادەمو حەووا ئەکاتو ئاگاداریان ئەکات کە شەیتان دوژمنی هەردووکتانە وورپابن فریووتان نەدات ، بەم شێوەیە ئەفەرموێ ( ان هذا

---

١ ـ ئایەتی ـ ١٩ ـ الأعراف ـ

عدوٌّ لك ولزوجك فلا يخرجنكما من الجنة فتشقى ) واتــه : ئادەم بە ڕاستی ئەو شەیتانــە دوژمنـــی خــۆتو خێزانەکەتــە ووریابن فریوتان نەدا بە فڕووفێڵو لە بەهەشت دەرتان بکات ، وەسەرگەردان بنو بچنە ڕیزی بەد بەختەکانەوە ٠

## ( ئادەمو حەووا لە بەهەشت هاتنە خوارەوە

## ( بۆسەر زەووی )

شەیتان ئەمەی بە چاک زانی کە خوا داری گەنمی لە ئادەمو حەووا قەدەغە کردووە ، وە بەم بۆنەیەوە کەلێ دل خۆش بوو ، وە ئاگری شەڕوو کینەی لە دڵا هەڵ گیرسایەوە ، وە ویستی ئەم کایە بە نرخە لە دەست نەداوو تۆڵەی دەرکردنی خۆی لە ئــادەم بکاتەوە ، وە بۆ ئەم مەبەستە کەوتە کار وەک خوا لە قورئــانــا بۆمان دەگێڕێتەوە وئەفەروێ ( فوسوس[1] لهما الشیطان لیبدی

1 ــ ( وسوس )ە لە شەیتانی جنیو ئینسیـەوە سەرچــاوە دەگرێ ، شەیتانی جنی بە هۆی خەتەرەو ڕازوو نیازی پەدەوە ، خۆی ئەگەیەنێتە دلی ئادەمیزاد ، وە پێــی ئەلێ ئەوو کارە بکە ، چادوور نیـە کە خوا هێزێکــی بە شەیتان دابێ کە ئەوو خەتەرەیە وەک برقی ئاوێتە بگرێتە دلی ئەوکەسەی کە ئەیەوێ ، ئەوجــا هێزی خێروو شەڕ بە گژ یەکدا بچنو ئەنجام یا خێر بەسـەر شەڕدا یا شەڕ بە سەر خێردا سەرە کەوێ (وَسْوَسَ)ە وەک دەنگی ژێی عەلاج دل ئەهەژێنێ

2 ــ ئایەتی ــ ١٩ ــ سورەتی أعراف ٠

ما ووريَ منهما من سوآتهما ) واته شەیتان بە خەتەرەی پیس لە دووژمنایەتی خۆیەوە خۆی گەیاندە ئادەمو حەووا وە هانی دان کە لە داری گەنم بخۆن بۆ ئەوەی پۆشاکی حیشمەتو شکۆمەندیان لە بەر دارنێو تووشی سزای خوایان بکات ، وە شەیتان بەم شێوەیە هاتە گۆ کە خوا بۆمان باس ئەکاتو ئەفەرموێ ( وقال ما نهاكما ربكما عن هذه الشجرة الا ان تكونا ملكين أو تكونا من الخاسرين وقاسمهما إنّي لكما لَمِنَ النّاصحين ) واتە : شەیتان بە ئادەمو حەووای گوت لە داری گەنم بخۆن ، خوداتان بۆیە لێی قەدەغە کردوون کە نەبنە فریشتەو ، هەتاهە تایە لە بەهەشتدا نەمێننەوە ، وە سوێندی بۆ خواردنو گوتی بە خوا قەسەم من ئاموژگارێکی ئەمینەوە دلسۆزم بۆتان وە سوودو قازانجی ئێوەم ئەوێ ( فدلاّهما بغرور ) جا شەیتان هانی دان تا لە پێکە چوونو گوناهەکەی پێ کردن وە بۆ ئەم مەبەستە هەموو هێزو توانای خۆی خستە کارەوە ٠

( فلمّا ذاقا الشجرة بدت لهما سوآتهما وطفقا يخصفان عليهما من ورق الجنة و ناداهما ربّهما ألم انهكما عن تلكما الشجرة واقل لكما ان الشيطان للانسان عدوٌ مُبين[1] )؟

جا کاتێ لە دارەکەیان چەژتو خواردیان سیپالی حیشمەتیان لە بەر دارنراوو ڕووتو قووت کرانەوە ، وە هەندێ لە زاناکان دەڵێن لە پێشدا ئادەمو حەووا بە پەردەیەکی شەفافی نووریین لەشیان داپۆشرابوو ، عەورەتی خۆیانو یەکتریان نەبینیوە ، وە گەلێ لە ئەهلی تەفسیر دەڵێن : حەووا زووتر

---

١ ـ سورەتی ـ الأعراف ـ ئایەتی ـ ٢١ ـ تا ـ ٢٢ ـ ٠

تەڵەی خوارد لە دارەکەی خواردوو پێش کەشی ئادەمیشی کردو ڕێگای ئەو گوناهەی بۆ خۆش کرد ، وە کاتێ کار لە کار ترازا زۆر دڵ تەنگو نیگەران بوون وە لە بەر شەرمو حەیا لە خوا هەندێ لە گەڵای دەرەختە کانیان لە خۆیانەوە ئاڵان ، وە زۆرێ لە زاناکان ڕایان وایە کە گەڵا هەنجیر بووە ، جا لەم کاتەدا بۆیان دەر کەووت کە بێ فەرمانی خوایان کردووە ، وە بە گوێی شەیتانیان کردووە ، کە گەورەترین دوژمنی ئادەمو ئادەمیزادە ، وە ئەم دوژمنایەتییە ڕوونو ئاشکرایە وە زۆر پەشیمان بوونەوە ، لەو کارەی کە کردوویانە ، وە عوزرو بەهانەیان بۆ خوا هێنایەوە بە ڕاستی ئەم بەڵایە کارێکی دڵ تەزێنە نەك هەر بۆ ئادەمو حەووا بە تەنها بەڵکوو بۆ ئادەمیزادیش بە گشتی ، وە لەم کاتەدا پەروەردگار بانگی داهێشتنو سەر زەنشتیکردن لە سەر ئەو گوناهەی کە کردوویانە ، فەرمووی ئایا ئەهیم لێ نەکردن ؟ کە لەو دارە مەخۆن وە پێم نەووتن بە گوێی شەیتان مەکەن ؟ چونکە بە ڕاستی شەیتان دوژمنێکی زۆر ئاشکرایە ، بەڵێ پێم ڕاگەیاندن ، بەڵام فەرمانەکەی منتان فەرامۆش کرد ·

بەڵێ لە بەر ئەوەی ئادەمیزاد لە بنەڕەتدا لە سەر سەهوو بیر چوونەوەو کەمو کووڕی فورسی بەستووەو ڕاهاتووە ·

کاتێ کە ئادەمو حەووا بە هۆی هەتەرەی شەیتانەوە لە بەری داری گەنمیان خوارد ، ئەوجا ڕووت کرانەوە لە نوور وە بە فەرمانی خوا وە بە هۆی ڕابەری نیگاوە کە جبریلی خاوەن شکۆیە ئادەمو حەووا هاتنە خوارەوە لە بەهەشتەوەو لە سەر زەووی دابەزینو هەر لەوێ جێگیر بوون ، ئەو زەوویەی کە بووە بێشکە بۆ پەروەردە کردنی ئادەمو ئادەمیزاد وەك خوا

ئەفەرمووێ ( قال اهبطوا بعضكم لبعض عدوٌ ولكم في الأرض مستقرٌ ومتاعٌ الى حين ، قال فيها تحيون وفيها تموتون ومنها تخرجون )واتە : خوا فەرمووی بە ئادەم و حەووا لە بەهەشت دەرکەوون و دابەزنە سەر زەووی وە لەوێ بگوزەرێنن ، وە هەندێ لە نەوەکانت ئەبنە دوژمنی هەندێکیان ، وە زەووی بۆ ئێوە ئەبێتە ئارامگاو جێگای حەسانەوەتان تائەو کاتەی کە خوا بۆی دەست نیشان کردوون ، وە هەتا ئاکامتان دێ •

هەر وەها خوا فەرمووی ئێوە لە مەولا لە سەر زەووی دێنە جیهانەوە وە لە سەر زەووی ئەمرن و تەمەنتان کۆتایی دێ ، وە لە ئاخی زەویشەوە سەر دەر دێنن و زیندوو ئەبنەوەو بەرەو شاری حەشرو مەیدانی کێشانەی کردار دەچن •

خوای گەورە رێگەی راست و چەوتی بۆ دەست نیشان کردووین ، جا هەر کەس مل کەچ بێ و پەیڕەوی فەرمانەکانی خوا بکا بێ گومان سەر دەکەوێت بە سەر گیروو گرفتی دونیا وە لە هەردوو دونیا بەختەوەرە ، وە هەر کەسیش کە رێگەی چەووت و گومڕایی بگرێت هەر لە دونیا سەر گەردانەو لەوە دونیا پش خوا دۆزەخیان بێ پڕ دەکاتەوە •

جا دەر بارەی هاتنە خوارەوەی ئادەم و حەووا چەند ڕاو بۆ چوونێ لە ئارادا هەیە ، یەکەم : ئەگێرنەوە ئادەم لە ئاخر کاتی ڕۆژی هەینیدا هاتە خوارەوە ، وە لە سەرەندیبی وولاتی هیند لە سەر شاخی ــ نوود ــ گیرسایەوەو دابەزی وە حەووای هەرەمیشی لە جیدەی وولاتی حیجاز دابەزی •

وە پەیوەندی ئەم ڕیوایەتە ئەدەنە پاڵ حەزرەتی علی و ئیبن و عەبباس و قەتادەو ئەبولعالییە ، جا ئەگەر ڕاست بێ کە

ئەمە حەدیس بێ‌و وە ئەم زاتانە نەقلیان کردبێ ئێمە بەتەواوی باوەڕمان پێی هەیە ، ئەگەر . نا ، ئەوەگومان دەگەیەنێ

وە لە گەلێ پەرتوکدا هەیە کە دەڵێ ئادەم پێنج سەد ساڵ بە دما گەووت وە لە شەرما سەیری ئاسمانی نەکرد .

بە هەر حاڵ ئادەم‌و حەووا لە گەڵ شەیتان‌و تەووس‌و مارەش وەك دەڵێن کە شەیتان چوبووە ناوو دەمیەوە چۆن هاتنە سەر زەووی‌و چەند ماوە مانەوە‌و ئادەم‌و حەووا لە کوێ گیرسانەوە وە بە یەکەوە بوون یا هەر یەکەیان لە وولاتێ گیرسانەوە ئەمانە گشتی جێی گومانن چونکە ئایەت یاحەدیسی ڕاستیان لە سەر وارید نەبووە ، واتە : ئەگونجێ وەهابێ‌و ئەشێ وەهاش نەبێ .

لێرەدا چەند پرسیارێ دێتە گۆڕێ ، ئایا ئەوو گوتانە کە جێگەی باوەڕی تەواو نین زانایانی ئیسلام بۆ ئەیان گێڕنەوە وە لەو باسەدا سوود یازیان تاچی ڕادەیەکە ؟ .

وەڵام : بۆ ئەوەی کە لە فەوتان ڕزگار کرێن وە جگە لەمەش لە عیبادەتا دروستە ڕەفتاریان پێ بکرێ وێڕای ئەمەش ئەگەر ئەو باسە هاوەڵێکی پێغەمبەر یاوەلییەك یا موجتەهیدێك فەرموویێتی ئەوە جێگەی باوەڕە .

بەڵام گومان لەوەدایە کە دوژمنانی ئاین بە ناوی پێغەمبەرێکەوە یا هاوەڵێکی پێغەمبەرەوە یا وەلییەکەوە هەڵیان بەستبێ وە دووتوێی تەفسیرو حەدیسیان هاویشتبێ ، هەتا گەلێ لەو هەوانە ئامۆژیانە پەیوەندیان داوەتە پاڵ حەزرەتی علی‌و ئیبن‌و عەباسەوە .

وە من وای بۆ دەچم ئەمەش بە هۆی ئەوەوەیە کە پێغەمبەر لە وەسفی حەزرەتی عەلی‌دا ئەفەرموێ : من شاری زانیاریم‌و عەلی

قاپیەکەیەتی ، وە دۆعای بۆ ئیبنو عەبباسیش کردووە کە خوا شارەزای بکا لە زانینی تەفسیردا ، ئەگەر ، تا ، حەزرەتی عەلی یا ئیبنو عەبباس یا هاوەڵێکی پێغەمبەر فەرموویێتی ئەمە حەدیسە بێ گومان جێگەی باوەڕە ، چونکە لە سەر چاوەی نووروو ڕووناکیەوە ئەوو فەرموودانە سەر چاوەیان گرتووە •

بەڵام ناحەزانی ئیسلام تا ڕادەیەکی زۆر لەم بارەیەوە هەڵیان بۆ ڕەخساوەو ، بەم بۆنەیەوە ڕەخنەیان لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام گرتووە ، بۆیەش پێغەمبەر لە بارەی ئەوانەوە کە درۆ بە دەم پێغەمبەرەوە هەڵ ئەبەستن بەم جۆرە هەڕەشەیان لێ ئەکات ( من كذب علىّ متعمداً فليتبوأ مقعده من النار ) واتە : هەر کەسێ درۆ بە دەم منەوە بکات با جێگەی خۆی لە دۆزەخدا ئامادە بکات •

بە کورتی ئەوەی کە گومانی تێدا نییە ئەمەیە : ئەو ماوەیە کە لە لایەنی خواوە دیاری کرابوو ئادەمو حەووا بە سەریان برد ، بە ترسوو بیمێکی یەکجار سەختەوە ، جا لە لای لە ترسی خوا ، وە لە لایەکی کەشەوە بەش بڕاوو بوون لەو هەموو نازوو بازیبەهەشتە ، ئەم نیگەرانییە کە بە سەریاندا هاتبوو هەر گیز بە خەویش نەیاندیتبوو ، بەڵام خوا پەیمانی بە بەندەکانی داوە کە لە پاش هەموو تەنگانەیەك خۆشیو فەرەجییە وە کاتی ڕزگاربوون نزیکە •

## ( پاڕانەوەی ئادەمو حەووا )

لە بەر ئەوە کە ڕەحمەتو بەزەیی خوا بوونەوەری پڕ کردووە ، وە بەزەیی ئەویش پێش قاروو غەزەبی کەوتووە جا بەحری بەزەیی هاتە جۆشو لە ماسی دوو بەندەی بێ چارەی

خۆی ، وە لەم کاتەدا خوا ئەم چەند گوتەوو پاڕانەوەی هاویشتە ناوو دلّی ئادەمەوە وەك خوا بۆمان دەگێڕێتەوە ( فتلقی آدم من ربّه کلمات فتاب علیه أنّه هو التوّاب الرّحیم )واتە ئـادەم وحەووا بەم چەند گوتەوو پاڕانەوەیە کە خوا خستبوویە دلیانەوە تەووبەیان کردوو وە لە لایەنی خواوە تەوبەیان لێ وەرگیرا ، چونکە بە ڕاستی هەر خوا لێ خۆش بووی گوناهەو . هەر ئەوە بە ڕەحمو بەزییە ، وە هەر ئەوە کە تۆبە وەر ئەگرێ ، لە کاتێکدا کە هەر بەندەیەکی لە گوناە بگەڕێتەوەو ، پەشیمان بێتەوە ، وە بە مەرجێ جارێکی کە نەگەڕێتەوە سەر ئەوو گوناهە ، وەئەمەیە مەرجێ تەوویەی بە ڕاستی ، بە مەرجێ حەقی خەلکی خوای لـە سەر نەبێ ، ئەگەر ، نا ، وێڕای ئەم سێ مەرجە ئـەبێ خـاوەن حەقیش ڕازی بکات •

وە پاڕانەوە کەش ئەمەیە : ( قالا ربّنا ظلمنا أنفسنا وان لم تغفر لنا وترحمنا لنکوننّ من الخاسرین[1] )واتـە : ئـادەمو حەووا پاڕانەوەو گوتیان ئەی پەروەردگاری ئێمە زولممان لە نەفسو خوودی خۆمان کرد ، کە لە بەری ئەودارەمان خواردووە لە فەرمانت دەرچووین وە ئەگەرتۆیشی لێمـان خۆشـں نەبـیو ڕەحممان پێ نەکەی ، بە ڕاستی ئێمە ئەچینە ڕیزی زیـان لـێ کەوتوانەوە لە پاش ئەم پاڕانەوە بە کوتە خوا تەوویەی لێ قبوول کردنو لێیان خۆش بوو •

وە بە ڕیوایەتێ خوا فەرمانیدا بە ئـادەم کـە بڕوات بـۆ

---

١ ـ سورەتی ـ الأعراف ـ ئایەتی ـ ٢٣ ـ

وولاتی حیجاز ، وە ڕۆیشتو لە خاکی عەرەفە حەووای دۆزیەوە ، وە لە مەککەدا جێگیر بوون ، وە هەر لەوێ دەستیان کرد بە خوا پەرستی ٠

ئەگێڕنەوە لە ئەبوو صالحەوەو ئەویش لە ئیبن و عەبباسەوە کە دەڵێ : ماوەی مانەوەی ئادەم لە بەهەشتدا بڕێتیە لە نیوو ڕۆژی ئەوە دونیا کە ئەکاتە پێنج سەد سالی ئەم دونیایە . وە ئەم بۆ چوونە هەندێ لە زاناکانی ئیسلام لێی ڕازی نین[1] ، وە هەر وەها لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوەو ئەویش لە ئیبن و عەبباسەوە ئەگێڕنەوە ، دەڵێ : خواعەهدوو پەیمانی لە نەوەکانی ئادەم وەرگرت ، لە نەعمان ـ کە جێگایەکە لە ـ عەرەفە ـ لەوەی کە لە پشتی ئادەما هەبێ لە زۆرپەت تا ڕۆژی دوایی ، وە لە نێوان دوو دەستەی قودرەتی خوایدا پرش و بڵاوی کردوونەتەوەو ڕای گرتوون وە هەموویان لە وێنەی گەردیلەدا وە لە پێشەوە گفتوو گۆی لە گەڵ کردوون بەم جۆرە : ( قال الست بربكم ) واتە خوا فەرمووی بە نەوەکانی ئادەم ئایا من خودای ئێوە نیم ؟ ( قالوا بلی ) نەوەکانی ئادەم هەموو بە جاری گوتیان بەڵێ تۆ پەروەردگاری ئێمەی ٠

ئەگێڕنەوە کاتێ کە ئادەم کۆچی دوایی کردووە نەوەکانی ژمارەیان گەیشتووەتە چل هەزار کەس ، وە لە بارەی مەرقەدی ئادەمەوە هەندێ دەڵێن لە مزگەوتی خیفە لە ـ مینا ـ ، وە هەندێ تر دەڵێن لە ئەشکەوتێکدایە لە شاخی ئەبوو قوبەیس ٠
وە هەندێ تر ڕایان جیاوازە لەوەدا کە لە کوێ ئەسپەردەی

---

١ ـ الكامل فی التاریخ ٠

خاکە • کەلێ لە زاناکان دەڵێن تەمەنی ئادەم هەزار ساڵە[1] •

وە لە ڕیوایەتێکدا دەڵێن : تەمەنی حەزرەتی ئادەم نزیکەی هەزاروو دوو سەد ساڵ بوو •

وە حەزرەتی حەووا بیست‌وو یەك سکی کردووە ، جا کچی سکی یەکەم بۆ کوڕی سکی دووەمی مارەی هاتووە ، جگە لە حەزرەتی ـ شیس ـ کە بە تەنها لە دایك بووە ، وە پێغەمەری خۆیشمان لە نەوەی ئەوە بۆیەش ئەوو پێغەمەرە لە باقی پێغەمەران گەورەترە •

حەزرەتی ئادەم لە لایەنی خواوە نیگای بۆ هاتووە وە خوا ڕەوانەی فەرمووە بۆ سەر نەوەکانی ، وە دەڵێن دە پەڕە یاسای لە لایەن خواوە بۆ هاتووە ، وە دەربارەی پێغەمەرێتی ئادەم خوا لە قورئانا باسی نەکردووە ، بەڵام خوا بە بێ ڕابەر گفتوو گۆی لە گەڵ کردووە ، وە هەروەها فێری یاسای ژیانی کردووە ، کەواتە حەزرەتی ئادەم پێغەمەرەو خواڕەوانەی فەرمووە بۆ سەرنەولادەکانی وە بەم ڕەنگە دڵمان پاڵ ئەداتەوە[2] •

---

١ ـ مروج الذهب لاپەڕە ـ ٤٨ ـ = ـ ٢ ـ اخبار الدول لاپەڕە ـ ٣٠ ـ سەر چاوەی ئاینی مامۆستا مەلاکریم•

٢ ـ ئەگیڕنەوە لە شاری دەمەنهووری میسرا پیاوێ تینکاری پێغەمەرێتی ئادەمی کردو وەدرا بە دادگای

←■

## ( جنـــىۆ )

خوا ئەفەرموێ لە بارەی دروست بوونی جنەوە ( وخلـق الجانَّ من مارجٍ من نّار ) واتە خوا خەلقی جینی کردووە لە بڵێسەی ئاگــر ، وە پێغەمەر لەم بارەیەوە ئەفەرمووێ : گومان لەوەدا نییە کە شەیتان لە ئاگرە ، وە فریشتە نییە ، وە ئاشکرایە کە خوایش فەرمان بە فریشتەکانی ئەدا کە کڕنووش بەرنـە بەر ئادەم ، چۆن بوو کە شەیتان لەعنەتـی لـێ کـراوو لـــە بەهەشت بەشی بڕاوو لەوێ وەدەر نرا ئەی خۆ ئاشکرایشـــە خوا هەرگیز زوڵم لە بەندەی خۆی ناکـات ، کەچـــی لێـرەدا دژایەتی پەیدابووە جا ئەگەر شەیتان مەبەست ئەبوایـە لـــە وەڵامدا شەیتان ئەی ووت ئەی خوا تۆ کەی فەرمانت داوە بـە من نافەرمان بەرداریت ئەکەم ، وەك خوا بۆمان ئەگێڕێتـەوە ( ما منعك ألاّ تسجد اذ أمرتك )واتە : لە بەرچییە کڕنووش نابەیتە بەر ئادەم کاتێ کە من ئەمرت پێ ئەکەم ؟

---

شەرعی ، دادگا بڕیاری دا کە ئەوکابرا کـافر بووەو ئەبێ لە ژنەکەی جیا بکرێتەوە ، وە لە دوایدا کابرا ئ یزی کردەوەو لە دادگای ئەسکەندەرییەوە ڕوو بە داد گا ووتی من لە قورئانا ئەم دیووە کە خوا ئادەم بە پێغەمەر ناوو بەرێ مـن مەبەستـم ئەمـە بـووە ئەگەر ، نا ، من باوەڕم بە پێغەمەرایەتی ئادەم هەیە جا دادگا بڕیاری دا بـە بەتالـی بڕیـاری یەکـەمو ژنەکەیان بـۆ گەڕانـەوە ٠ ( قصـص الأنبیـــاء ) عبدالوهاب النجار لاپەڕە ـ ١٠ ـ

لە وەڵامدا شەیتان هیچ داددو بێ دادی نەکرد ، وە لەوو ئەمرە حاشای نەکرد وێڕای ئەمەش مل هوڕی کردوو خۆی بە زل گرت .

## ( بزانــــن )

دەرکردنی شەیتان لە بەهەشتو کەڕانەوەی جارێکی تر بۆ بەهەشت کارێکی مەحاڵ نییە ، وە عەقل بە دروستی ئەزانێ ، کە بە گومڕایی خۆی بچێتەوە بەهەشتو ئادەمو حەووا هەڵ فریوێنێو کوڵی دڵی خۆی بەوان دامرکێنێ ، یاخود ئەشێ هەر لە دوورەوە وەك برقی ئاوێنە شەیتان خەتەرەی خۆی بگرێتە ئادەمو حەووا .

وە هەروەها ئەگونجێ ئەوو خەتەرەیە وەك تەلەفوونو لاسلکی یا وەك جادوو ـ سیحر ـ لە دەرەوەی بەهەشت بە ئادەمو حەووای گەیاندبێ ، وە یاخود دوور نییە لە سەرەتای دەرکردنیەوە کە هێشتا هەر لە بەهەشتا بووە ئەم سوێندەی بۆ ئادەمو حەووا خواردبێ ، وە لە دوایدا ئەوو ڕازوو نیازەی شەیتان لە دڵی ئادەمو حەووادا بنجی داکوتابێو جێگای لە دڵیانا کردبێتەوەو ، وە لێیان بە ڕاست گەڕابێ وە لە دارەکەیان خواردبێ .

## ( یەکەم ئارامگای ئادەمو حەووا )

یا ئەو بەهەشتەی کە ئادەمو حەووا تیایدا جێگیر بوبوون ، جا دەربارەی ئەو بەهەشتە خوا ئەفەرمووێ ( وقلنا یا ادم اسکن أنت وزوجك الجنة )واتە وە ئێمە بە ئادەمان

گوت ئەی ئادەم خۆت و خیزانەکەت لـەم بەھەشتـەدا جێگیـر بن ..

ئایەم جۆرە خوای گەورە بەر پەرچی ئەوو خاوەن گرمانانە ئەداتەوە . رای کۆمەڵێ لە زانایانو ئەھلی تەفسیر وەھایە :

ئەوو بەھەشتەی ئادەمو حەووا بەھەشتی ـ خولد ـە ، وە لە ئاسمانە ، وە ئەم زانایانە گەلێ بەڵگەوو دەلیل ئەھێننەوە بۆ ئیسپاتی رایەکەیان ، یەکێ لەوو بەڵگانە ئەمەیە : ئەلفوو لامی ( الجنة ) لەم ئایەتەدا بۆ تەعریفو پێناسەیە ، وە بە گوێرەی یاسای رێزمان بۆ مەھدی زیھنیە ، واتە کاتێ کە ئەم ئایەتـە ئەخوێنینەوە ھەسـتی دەروونمان بۆ ئەوو بەھەشتە دەچێ کـە خوا لەوەسفیدا ئەفەرمووێ ( وبشّر الذّين آمنوا وعَمِلـوا الصّالحات أن لهم جنات تجري من تحتها الأنهار كلّما رزقوا منها من ثمرة رزقاً قالوا هذا الذي رزقنا من قبل وأُوتوا بـه متشابهاً ولهم فيها أزواج مطهرة وهم فيها خالدون[1] )واتە ئەی پێغەمبەری خوا مژدە بدە بەو خاوەن باوەڕانە کە کردەوەی چاکە ئەکەن وە بەندایەتی بە ڕاستی بۆ خوا ئەکـــەن ، کـــە بەھەشت بۆ ئەوانە ئەو بەھەشـتەی کە لە ژێر داروو درەختو کۆشکەکانیدا ئاوو ڕوبار جارییە ، وە ئەھلی بەھەشت ھەرکاتێ خواردنێ یابەری درەختێ ئەخۆن دەڵێن : وێنـەی ئـەم رزقو ڕۆزییەمان لە دونیادا خواردووە ، وە کاتـــێ لـەوو میـوەو خواردنەیان بۆ دێنن دەڵێن : وێنەی ئەمانە مـــان لـە دونیـادا خواردووە ، بەڵام تـامو لەزەتـی جیـاوازە ، وە جۆرێـیو

[1] ـ البقرة ئایەتی ـ ٢٥ ـ .

ئالوەتی زۆر جوانو پاكو خاوێنی تێدایە ، كە هەمیشەو دایم لە خوێنی بێ نوێژیو پیسی ی نەقلەتاووی پاكو بێ گەردن ، هەروەها خوا بە بەهەشتیەكان ئەفەرمووێ ئێوە بخۆنو بخۆنەوەو لەزەت وەرگرنو لە بەهەشتدا هەتا هەتایە تیادا بمێننەوە ، وەك باسمان كرد مەبەست لەوو بەهەشتەی ئادەمو حەووا ئەو بەهەشتەیە كە پانیەكەی بە قەدەرئەرزو ئاسمانەكانە٠

وە خوا بۆ خاوەن باوەڕانی ئامادە كردووە ، وە ئێستا هەیە وە ئەو بەهەشتەش ئەبێ ئەم سیفەتانەی تیادا بێتە جێ وە ئەبێ دیمەنی ڕازاوەتر بێ لە هەرچی شتێ كە ڕازاوەیە لە كۆشكو تەلارو ئاوو ڕوبارو جۆگەی هەنگوینو شیرو شەكرو هەرەقێ كە سۆڵ سەر خۆش نەكا وە ئەوەی كە چاو پێی خۆش بێو دڵ ئارەزووی بكا تیادا هەبێ وە بە هەشتێ كە تینوێتیو برسیەتیو ڕووتیو سەرماو گەرماو نەخۆشیو ئازارو خەمو خەفەتی تیادا نەبێ ، بەڵام لە بەهەشتی دونیادا هەرگیز ئەم هەموو وەسفە مەحالە كە تیادا بێتە جێ ، كەواتە ڕوونو ئاشكرایە كە خوا بە هەشتی ـ خولد ـی مەبەستە كە لە ئاسمانە نەك لە ئەرز ، بەڵام موعتەزیلەو ئەوانەش كە جێ بێو شوێنەواری ئەوانیان هەڵ گرتووە دەڵێن ئەگەر ئەو بەهەشتە بەهەشتی ـ خولد ـ بوایە خوا مەنعی خواردنی گەنمی لە ئادەمو حەووا نەدەكرد ، وە دەریشی نەدەكردن چونكە جێگای تەكلیف نیە ، بەلكوو ئەو بەهەشتە باخێكە لە خاكی یەمەندایە ٠

جا ئەهلی تەفسیر وەڵامیان ئەدەنەوەو دەڵێن كەسێ لە بەهەشت دەرناكرێ كە ئەم مەرجانەی تیادا هاتبێتە جێ :ـ

یەکەم ئەبێ خاوەن باوەڕبێ ، دووەم لە پاش مردنی چووبێتە بەهەشت سێیەم کە بکاتە پاداشی خوا کە پەیمانی داوە بە بەندەکانی بە چوونە بەهەشت ، ئەگەر ، نا ، خۆ پێغەمبەر (د) لە شەووی میعراجا کاتێ کە خوا میوانداری بۆ کرد چووە بەهەشتو بە ناویدا گەڕاو کەچی دوایشی هاتەدەرەوە ، وێڕای ئەمەش بەهەشتیەکان هەر ئەمەندەیان لە مەرە کە خوا بناسنو بە تاکی بزانن ، وە ئەگەر ئەو بەهەشتە لە خاکی یەمەنە بۆچی تا ئێستا زاناکان شوێنەواری ئەو بەهەشتەیان نەدۆزیەوەو کەشفیان نەکرد ؟ کاکە پێی ناوێ پارمەتی خوا مەدە چونکە ئەو هەرگیز پێویستی بە پارمەتی و پینەو پەڕۆی ئێمە نییە ئەگەر ، نا ، بەکاری خوایەتی نایەت ؟! ٠

وە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەریش بەلگەیە لە سەر بەهەشتی ـ خولد ـ کە ئەفەرمووێ ( یجمع الله الناس فیقوم المؤمنون حین تزدلف لهم الجنة فیأتون آدم فیقولون ـ یا أبانا استفتح لنا الجنة فیقول وهل أخرجکم إلاّ خطیئة أبیکم ) ؟ ٠

واتە : خوا لە ڕۆژی دوایدا هەموو ئادمیزاد کۆ ئەکاتەوە وە لە مەیدانی حەشرا ڕایان دەگرێ ، جا لە کاتێکدا بەهەشت خۆی ئارایشت ئەداوو خاوەن باوەڕان هەڵئەستنو دەچن بۆ لای ئادەمو پێی ئەڵێن : ئەی باوکی ئێمە شەفاعەتمان بۆ بکە لای خوا ودەرگای بەهەشتمان بۆ وەکە ، ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ ئایا ئێوە لە بەر گوناهی باوکتان نەبوو کە دەر کران لە بەهەشت ؟ ٠

## ( پێغەمبەران )

باوەڕبە پەیامبەران یەکێکە لەوشەش پایەی ئاینی پاکی ئیسلام جا پێویستە لە سەر هەموو مرۆڤێ پیاو یاژن باوەڕیان پێ بێنن ، وە بیان ناسن ، پێغەمبەران [ د ] چەند کەسێکی ئازادی تێرینەن پەروەردگار لە ناو کۆروو کۆمەلی ئادەمیزادا هەلبژاردوون و ڕەوانەی فەرموون بۆ سەر ئادەمیزاد ، وە بۆ ئەوەی مژدە بدەن بەو کەسانەی کە باوەڕ دێنن‌و کردەوەی چاکە ئەکەن ، بەڕەزا مەندی خواو بەهەشتی بەرینو ژیانی هەتا هەتایی ، وە هەڕەشە بکەن لەو کەسانەی کە باوەڕ ناهێنن‌و کردەوەی بەدوو ناپەسەند ئەکەن بە قاروو غەزەبی خواو چوونە ناوو دۆزەخی هەتا هەتاییەوە ٠

خوا ئەفەرمووێ [ وما نرسل المرسلين الا مبشرين ومنذرين فمَنْ امن واصلح فلا خوف عليهم ولا هم يحزنون ]واتە : وەنەبێ کە ئێمە پێغەمبەرانمان ڕەوانە کردبێ بە بێ هوودە بەلکوو تەنها بۆ ڕاگەیاندنی ڕاسپاردەکانی خوا بە بەندەکانی ، وە مژدەدان بە خاوەن باوەڕان وە هەڕەشە لە بێ باوەڕانە ٠

جا هەرکەسێ باوەڕی هەبێ‌و کردەوەی چاك بێ ئەوە لە ڕۆژی دوایدا ترس‌و بیمی نییە ، وە هەر کەسیش بە پێچەوانەوە جوولابەوەو گومڕابوو ئەوە دۆزەخ بۆ ئەوو باشترین جێگایە ٠

جا ئەم پێغەمبەرانە لە لایەن خواوە دەستوورو یاسای ژیان‌و زانیاریان پێ گەیشتووە ، جا یا بە هۆی خەوبینیەوە یا خوا خستوویەتیە دلیانەوە یا بە وەحی‌و نیگاوە وە بە هۆی ڕابەری نیگاوە کە جبرەئیلی ئەمینە بۆیان هاتۆتە خوارەوە ، وە ئەو

پێغەمبەرانە خوا پارازتوونی لە دوژمنانی ، وە لە نەخۆشی بەدوور نەفرەتاوی ، وەکو گولیی و گەڕی و بەلەکی ، وە عاقڵ و ژیرو ڕۆشن بیرو ڕەوان بێژ بوون ، دوور بوون لە نەفامی و هەڵەو هەرزەیی و نەنگی ، وە مەزارییان پەسەند کردووە ، دوور بوون لە تەماعی دونیایی ، وە سەخی و دڵگوشاد بوون ، وە دوور بوون لە ڕەزیلی و بەرچاو تەنگی ، بە ڕەحم و بەزەیی بوون ، وە دوور بوون لە دڵ ڕەقی و هەرزەگۆیی ، بە ئارام بوون و دوور بوون لە هەڵەو هەرزەیی ، ئازاو بە جەرگ بوون و دوور بوون لە سستی و نەتوانین ، وە ڕاست گۆ بوون و دوور بوون لە درۆو ناڕاستی ، ئەمین و ئاشتی خواز بوون و دوور بوون لە شەڕو خیانەت ، وە زیرەک و ووریا بوون ، دوور بوون لە گەوجەنی و تەمەڵی ، زاناو پسپۆڕ بوون لە هەموو میلمێکدا دوور بوون لە جەهل و نەزانین ، هەر گیز بە تەواوی تێریان نەخواردووە ، وە دوور بوون لە ئیسراف و زیادە ڕەوی ، وە هەمیشە لە خوا ترساون و دوور بوون لە بێ باکی و لە خۆ بایی ، وە ڕەوشتیان بەرز بووە و دوور بوون لە ناباری و بێ ڕەوشتی ، ئەمەندە ڕەووشت بەرز بوون خوا بۆ خۆی وەسفی کردوون ، هەموو پێغەمبەران لە پاکترین و بە شەرەف ترین بنە ماڵەو هۆزوو تیرە خوای گەورە هەڵی بژاردوون ، وە ڕەوانەی کردوون ، بە کورتی پێغەمبەران نیشانەی بەندەی بە ڕاستی خوان وە ئەوەندە دوورن لە ئارەزوو سیفەتی ئاژەڵییەوە هەر بە ناو ئادەمیزادوو لە ڕەوشتا فریشتە بوون ٠

## ( بزانــن )

پێغەمەر کەسێکە کە لەلایەنی خواوە دەستووری بۆ هاتبێ ، وە فەرمانی پێ درابێ کە ئەو دەستوورە ڕاگەیەنێ ، وە ـ نەبی ـ کەسێکە کە یاسای بۆ هاتبێو بەڵام فەرمانی ڕاگەیاندنی پێ نەدرابێ ، واتە هەموو پێغەمەرێ پێی ئەووترێ ـ نەبی ـ بەڵام هەموو ـ نەبییەك ـ پێی ناووترێ پێغەمەر

## ( هەڵ بژاردە لە ئادەمیو فریشتە )

لەم بارەیەوە خوا ئەفەرمووێ ( اللّه يصطفي من الملئكة رُسُلاً ومن الناس أنَّ الله سميعٌ بصير ) واتە : خوا لـە ناو کۆمەڵی فریشتەدا چەند کەسێکی هەڵ بژاردووە وە لـە خـۆی نزیك کردوونەتەوە ، وە کارەکانی خۆی پێ سپاردوون ٠

وە هەروەها لە ناو کۆمەڵی ئادەمیزادیشا چەند کەسێکـی هەڵ بژاردوونو وە لە خۆی نزیکی کردوونەتەوەو ، خەڵاتـی پێغەمەریتی پێ بەخشیـون ، بـە ڕاستی خوا بینـاوو گۆیایـە وە خوا ئاگاداری هەموو هەڵسوکەوتێکی ئەم بوونەوەرەیـە بە ووردوو درشتیەوە ٠

جا هەڵ بژاردنو ڕەوانە کردنـی پێغەمـەران وە نەبـیێ شتێکی بێ کەڵكو بێ هوودە بێ بۆ ئادەمیزاد ، جا نەك هـەر تەنها قازانجو بەرژەوەندی ئادەمیزادی تێدایە بەلکوو جنۆکەو فریشتەکانیش لەم بەهرەو بەزەیی خوایە بەشدارن ، وە تیکڕا هەرسێ جۆرەکەی گرتۆتەوە ، ـ وە بەر بەزەیی خوا کەوتن ،

وە بەم بۆنەیەوە ڕێگای ڕاستو چەوتیان لە یەك داپڕیو جیایان کردەوە ، هەتا کافرە کانیش لە ژیانی دونیایاندا بەهەرەیان وە دەست هێنا ، وە کەلکی زۆریان لێ وەر گرتووە ۰ جا ئەك هەر ئەم سێ جۆرە لە ــ مەخلوق ــ بەلکوو گیان لەبەرانیش لەم بەهرەیە بەهرەمەند بوون ــ[1] ۰

بەلام بەداخەوە هەندێ کەس وەها گومان ئەبەن کە پێغەمەر هەربۆ ئەوان ڕەوانە کراوە ، وە هەر تایبەتن بەوانەوە ، وە گەلەکانی تر بێ بەشن لەم بەهرەیە ، وەهاگومان ئەبەن کە خوا ئەوانی بە تایبەت خەلق کردووە ؟!۰

بەلام ئەم جۆرە کەسانە بە پێچەوانەوە لە ئاینو یاساکانی خوا گەیشتوونو بە هەڵەدا چوون ، وە خوای گەورە بۆ هەموو گەلێكو ڕەگەزێ وە بە هەموو زمانێ پێغەمەرانی ڕەوانە کردووە لە خودی خۆیانەوە بۆ خۆیان ، وە بۆ سوودو بەرژەوەندی ئادەمیزادو فریشتەو جنی بە تایبەتی ، وە هەموو گیان لەبەران بەگشتی ، وە بۆ ئەم مەبەستە خوا ئەفەرمووی ( ولقد بعثنا في كلّ أمةٍ رسولاً أن اُعبدُوا الله واُجتنبوا الطّاغوت فمنهُم

1 ــ ئەو حەیوانانەی کە بەهرەمەندن : وەکو سەگی ( أصحاب الكهف ) وگوێ درێژەکەی عوزەیر پێغەمەرو بەرانەکەی ئیسماعیل ، جگە لەمانەش هەر بە هۆی باوەڕەوەیە کە مرۆڤ بەزەیی بەگیان لەبەرانا دێتەوە

مَن هَدَى اللهُ وَمِنْهُم مَنْ حَقَّتْ عليه الضلالة[1] ) واتە : بە ڕاستی ئێمە بۆ هەموو گەلێ پێغەمبەرمان ڕەوانە کردووە لە خۆیانەوە بۆ خۆیان ، وە بۆ ئەوەی کە ڕێنماییان بکەنەوە تەنها بەندایەتی بۆ خوا بکەنو هەر ئەو بپەرستن ، وە بۆ ئەوەی واز لە پەرستنی داروو بەردوو بتوو ئادەمیزاد بێنن ، جا هەندێ لەوکەسانە خوا بارمەتی دانو ڕێگای ڕاستیانگرت ، ئەمانە ئەگەنە پاداشی خوا وە هەندێ کەس لەوانە ڕێگای چەوتیان بۆ خۆیان هەڵ بژاردو سەریان لێ تێك چوو ، ئەنجام ئەگەنە تۆڵەو سزای ·

## ( پەیامبەران )

پێغەمبەران چەند کارێکی گەورەو گرنگو بە سوودیان لەلایەن خواوە پێسپێرراوە ، کە ڕای گەیەنن بە بەندەکانی ·

بە کورتی یەکەم : باوەڕ بە بناغەی ئیمان ، کە بریتیە لە شەش پایە ، باوەڕ بە خوا ، بە فریشتەکانی ، بە پەرتووکەکانی، بەزیندوو بوونەوەی ڕۆژی دوایی ، وە قەزاو قەدەر ·

دووەم : باوەڕ بە فەرمی دینو بەجێ هێنانی لقەکانی ، کە بریتیە لە پێنج بەند : یەکەم ووشەی ( أشهد أن لاَ أله الاَّ اللهُ ، وأشهد أن محمداً رسول الله )یە ، دووەم : لە شەوو ڕۆژێکدا پێنج فەرز نوێژە ، سێیەم : ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان هەموو سالێ مانگێ ، چوارەم : زەکاتە ، پێنجەم : حەجی مالی خوایە ·

وە سێیەم : بەیان کردنو ڕوون کردنەوەی یاساکانی خوایە، کە ئەویش بریتیە لە خۆشیو بەرژەوەندی هەردوو جیهان ، جا خوێنەری بەڕێز باوەڕ هێزێکی کاریگەری سەرەکییە و لە ناو

---

١ ــ سورەتی نەحل ئایەتی ــ ٣٦ ــ ·

گلێنەی ئادەمیزادا جۆشی خواردووە و پنجی بە ستروەو تێکەڵی
خوێنو ڕەگو دەماری بووە .

جا هەموو کەسێ دەزانێ کەوا هێزێ هەیە کە لە هێزێ
خۆی گەلێ بە هێز تروو بەرزترە ، بەڵام لە وەسفی ئەوهێزەدا
گەلێ جیاوازکاری دژوار لە نێوانیاندا هەیە ، وەك لە پێشەوە
باسمان کرد کە هەندێ دەڵێن : ئەوهێزە .

سروشتە هەندێ دەڵێن ڕێکەوتەو هەیە دەڵێن فەلەکەو
هەندێ دەڵێن ئاگرەو هەندێ دەڵێن شەیتانەو هەندێ دەڵێن بتەو
هەیە دەڵێن مانگو ڕۆژە ئەستێرەیە هتد .

جا بە ڕاستی خەڵکی خوا هەمیشە مان لە کێشەو پێش
بڕکێدا لەم بوارەدا وە هەر یەکەیان ڕێبازەکەی خۆیی بەلاوە
پەسەندە وە خوای گەورەش پێغەمەرانی ڕەوانە کردو وە ڕێگەی
ڕاستیان پیشان داینو ئیمانو باوەڕیان خستە دڵی ئیمان
دارانەوەو دڵمان پاڵی دایەوە .

جا هەر مرۆڤێ کە کەمێ هەستی مرۆڤایەتی تیایێ ئەزانێ
کە دوای ئەم ژینە سەر لە نوێ ژیانێکی بێ کۆتایی دەست پێ
دەکاتەوە وە جگە لەمەش هەر کەسێ باوەڕی بە زیندو
بوونەوەی ڕۆژی دوایی نەبێ ئەوە بە ڕاستی تووشی نەخۆشی
دەروونیو کارەساتێکیی دژوار هاتووە وە هەر گیز دڵی لەدوو
دڵیو گوماندایەو دڵی پاڵ ناداتەوە وە لە کاتی تەنگانەدا پەردەی
سەبری تەنکەو زۆر زوو شەکەتو ، ماندوو دەبێ ، چونکە هیچ
مرۆڤێ لە گیروگرفتو نەخۆشیو دەردی سەری خالی نیە ، وە
کەس نیە زوڵمی لێ نەکرێو بەشی نەخورێو مردووی لێ
نەمرێو تووشی بەڵاو کارەسات نەبێت ، وە بێ گومانم کەسێش

ناتوانێ بەرەنگاری ئەم ڕاستیە ببێو بەر پەرچی بداتەوەو بەر هەلستی لێ بکا ·

بەلام ئەگەر کەسێ کە خاوەنی باوەڕ بوو ئەبێتە ئینسانێکی بە ئارامی هێدیو هێمنو لە خۆبووردوو ، وە ئەتوانێ بەرگری لە گەلێ ناخۆشیو تەنگانە بکات وە ئەوکەسە بە ئارامەو دلی پاڵ ئەداتەوە چونکە باوەڕی بە پاداشی ڕۆژی دواییو ڕەزامەنـدی خواو چوونە بەهەشتو شادبوونەوە بە کەسو کاری هەیە ، وە باوەڕی بەوە هەیە کە هەتا دڕکێکیش بچێ بە پێیدا یا خۆیشـی پێی پیادا بێ لای خوا پاداشی هەیە ، وە لێی ڕوونە کـە هـەر کەسێ زولمی لێ کردبێو لێی دابێو یاخود کوشتبێتی تەنانەت هەیبەتێکی کردبێ حەقی ناڵەوەوتێو بە چەنـد قـات دەستـی دەکەوێتەوە ·

وە لە هەموو گرنگتر ئەمـەیە کە مرۆڤی خاوەن باوەڕ لە ترسی خواو ڕۆژی دواییو زیندو بوونەوە ، وە لـە ترسـی ئەوە کە لە ڕۆژی دوایدا ڕا ئەگیـرێ لە نێـوان دوو دەستـەی توانایی خوادا ، کاتێ بیر لەمانە ئەکاتەوە ئەو جا خـۆی لـبـە زۆرووو ستەمو دزیو چەردەیيو ڕێ گرىو کوشـتنو بڕیـنو تالانو تاوانو داوێن پیسیو بوهتانو غەیبەتو فیتنەیی دوور ئەخاتەوە ، بە کورتی هەر کارێ کـە ناڕەواو ناپەسـەندەو هەر پێنی خراپەی لێ بێ واژی لێ ئەهێنێ وە لە سنووری یاسای ئاینو مرۆڤایەتی دەر ناچێ ·

وە هەر ئەمەشە کە ئەبێتە هۆی سەر بەستیو ئازادیو خۆش گوزەرانی لە هەردوو جیهاندا ، ئەگەر ، نا ، هیچ دەستووروو یاسائ وە هیچ هێزێ نیيە جگە لەمە کە ئەو مەبەستە بگەیەنێ ،

کەواتە هەر بە هۆی ئامۆژگاری پێغەمەرانەوەیە کە ئادەمیزاد ڕێگەی ڕاستو چاك ئەدۆزێتەوە ، وە واز ئەدا لە کاری ناڕەوا ئەگەر ، نا ، ئینسان ناتوانێ بگاتە ڕادەیەك کە چی باش بێ بیکاتو چی خراپە نەیکات چۆن وانیە ؟ لەوەتەی ئاینی پاکی ئیسلامسان پشت گوێ خستووە ئەم دیاردەیە هەر بە ئاشکرا دیارە ・

گەلێ کەس وەها گومان دەبەن کە ئەم کارە چاکە کەی ئەکەر سوودوو بەرژەوەندی خودی خۆیی تێدابێ ، بەڵام ئەم قازانجەی ئەو بەزەرەری کەسێکی تر تەواوو دەبێ ، وە گەورەترین بەڵگە لە سەر ئەم ڕاستیە ئەوەیە لەم چەرخەی ئێمەدا حەق لە ژێر ناحەقدا ئەتلێتەوە و ئەناڵێنێ ؟ جگە لەمانە کە خۆمان بە چاو ئەیبینین لەم جیهانەدا لە زوڵمو زۆرو کوشتنو بڕینو ماڵی هەژارو بێ تاوان خواردنو بەسەریەکدا چوون ・

لە پەرتوکی [ مع الأنبیاء ]دا دەڵێ : پێغەمەران بۆ گورووی ئادەمیزاد گەلێ پێویستن ، وە زانیاری تازەش تازە ڕوونی دەکاتەوە کە عالەمێکی ڕۆحانی جگە لە ــ مادە ــو قەوارە هەیەو مەوجوودە ، بە جۆرێ کە لە نێوان ڕۆحو لاشەدا هیچ پەیوەندییەك نییە ، جا لە بەر ئەم مەبەستە پێغەمەران ــ وە نیگاو وەحی خودا شتێکی نەگونجاوو دوور لە ئەقڵەوە نییە ، بەڵکوو عەقڵ پەسەندی دەکات ، وە هەر وەها دەڵێ لە ساڵی ــ ١٧٧٠ ــ هەزارو حەوت سەدوو حەفتا زانایەکی ئەڵەمانی بە ناوی دوکتور [ مووسمیرە ]وە لە دوای گەلێ تاقی کردنەوە بە هۆی هێزی موگناتیسەوە ئیسپاتی کرد کە لەشی مرۆڤ تەنها گلێنەیەکی بەتاڵو هەتاڵ نییە بەڵکوو ئەو گلێنەیە ئارامگای ڕۆحە کە لە

هەموو ڕووبەکەوە جیاوازییان لە نێوانتدا هەیە ، وە دەڵێ مرۆڤ خاوەنی عەقڵێکی نهێنیە ، وە لەم عەقڵە سادەو مادەتییەی ئێمە گەلێ بەرزترە ، کە ئەویش پەیوەندی بە عالەمی ڕۆحانییەوە هەیە ، جا ئەم ڕوون کردنەوەو بۆ چوونە زانایانی ـ ماددی ـ سەر گەردان کردووەو ماوەی یەك سەدەی ڕەبەق لە گەڵ ئەم بیرەدا جەنگاوون ، وە لە کۆتاییدا ئەم زانایە توانی سەر کەوێ بە سەر دوژمنەکانیدا ، وە هەموو ئەم ڕایەیان پەسەند کرد ٠

لە سەر هەموو خاوەن باوەڕێ پێویستە کە باوەڕی تەواوی بە هەموو پێغەمەرانو نەبییەکان هەبێ ، وە نابێ بە هیچ جۆرێ جیاوازی بخەینە ناو پێغەمەرانەوەو باوەڕمان بە هەندێکیان بێو وە باوەڕمان بەهەندێکیان نەبێ ، وە پێویستە ڕێزیان لێ بگرینو هەموویان بە ڕاست بزانین ، وە هەر کەسێ باوەڕی پێیان نەبێ پاجنتویان پێ بدات ئەوە پێی کافرەو گەردنی لە ئیسلام بەریە پەنا ئەگرم بە خوا لە قارو غەزەبی ، وە ئەبێ باوەڕمان بەوە هەبێ کە خوا پێغەمەرانی خۆی لە دوژمنانی دین پارازتووە ، وە باوەڕمان بێ کە لە ناو پێغەمەرانا پێنج پێغەمەر هەیە لە هەموویان گەورە ترن ، وە پێیان ئەووترێ ـ ئوو لولعەزم ـ واتە خاوەنی هێزی بەتەوو وورەی بەرزن ، کە ئەمانەن ١ ـ نووح ٢ ـ ئیبراهیم ٣ ـ مووسا ٤ ـ عیسا ٥ ـ محمد ـ درووودی خوایان لە سەر بێ ، وە لە ناو ئەم پێنجەشدا پێغەمەری خۆشەویستمان لە هەر هەموویان گەورە ترو خۆشەویستترە لە لای خواو بەندەکانی وە پێویستە باوەڕمان هەبێ بە هەموو پێغەمەرانو نەبییەکان کە بێ گوناه بوونو خوا لە گوناهی گەورەو بچووك پارازتوونی وە هەر وەها

ئەبێ باوەڕمان هەبێ کە پێغەمەران مرۆڤن‌و پێویستە دوای کردارو ڕەفتارو گوفتاریان بکەوین وە ئەبێ باوەڕمان بە هەموو موعجیزەی پێغەمەران هەبێ ٠

## [ موعجیزە ]

بریتیە لە کردارێ کە لە داب‌و نەریتی گومەڵ بە دەرە وە جگە لە پێغەمەران کەس ناتوانێ بەو کارانە هەڵسێ ، جا ئەم بەهرە گەورەیە هەر تایبەتە بە پێغەمەرانەوە ، وە ئەگەر لە سەر دەستی مەردمێکی چاکی خاوەن باوەڕدا ئاشکرا بوو ئەوە پێی ئەووترێ ـ کەرامەت ـ وە ئەگەر ئەو کردارە لە سەر دەستی مرۆیەکی خراپ‌و بێ باوەڕدا هاتە دی ئەوە پێی دەگوترێ جادوو ـ سیحر ـ وە جادوو بە هەموو جۆرەکانیەوە حەرامەو ناڕەوایە جا لە بەر ئەوەیە کە جادوو بریتیە لە چەند ڕوو کەش‌و درۆو هەڵ فریوانێ کە مرۆ بە هۆی ئەو ڕوو کەشەوە کە دوورە لە ڕاستی توشی زەرەروو زیان ئەبێت ، وە لە ڕاستی دووری ئەخاتەوە ، جا خوا بەهەر پێغەمەرێ جۆرێ لە موعجیزەی پێ بەخشیوە ، وە تێکڕا شێوەکانیان لە یەکتر جیاوازە ٠

## [ چەند موعجیزەیەك ]

حیکمەتی پەروەردگار وەها داخوازی کردووە کە هەر پێغەمەرێ بە گوێرەی پێویستی ئەو ڕۆژگارە موعجیزەی بۆ هاتووە ، وە لە لایەنی خواوە یارمەتی دراوون‌و پاڵپشتی کراوون ، وە لە دوژمنانی دین ڕزگار کراوون‌و پارێزراوون ، جا با لە یەکەم پێغەمەرەوە دەست پێ بکەین کە حەزرەتی ئادەمە وباوکە گەورەی هەموو پێغەمەرانو ئادەمیزادە :ـ

جا یەکێ لە موعجیزەکانی حەزرەتی ئادەم ئەمەیە : خوای

گەورە ناوی هەموو شتێکی فێر کردووە وە زانیارییەکی گشتی پێ بەخشی ٠

دووەم : حەزرەتی نووح کە بەفەرمانی خوا یەکەمین کەشتی دروست کرد ، کاتێ ئاو هاتە دەرەوە لە تەنووور ، حەزرەتی نووح و کۆمەڵەکەی چوونە ناویەوە ، کەچی ئەو کەشتییەش بەردوو هەڵوو زوو گازوو بەتزین و سووتەمەنی تیدا نەبوو ، بەڵکوو ئەو کەشتییە لە ژێر چاو دێری خودایا بووە، وەك خوا ئەفەرمووێ ، ( تجری باعیننا )واتە : ئەو کەشتییە لە ژێر چاوە دێرێ ئێمەدا بەرز ئەبێتەوەو دائەبەزێ ٠

سێیەم : پێغەمبەر حەزرەتی ئیدریسە وە یەکێ لە هەرە موعجیزە گەورەکانی ئەمەبوو کە خوا بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان وەك خوا لە قورئانا ئەفەرمووێ ( ورفعناه مكاناً عليا )واتە : ئێمە ئیدریسمان بەرز کردەوە بۆ جێگایەکی بەرزوو بەقەدر کە ئاسمانە ، هەر وەها حەزرەتی ئیدریس بۆ یەکەم جار نووسین و هەیاتی داهێنا ، وە بە حیکمەت و زانیاری ئامۆژگاری خۆی بە خەڵکی فێر کردووە ، وە ئەو حیکمەتانە بە گەلێ زمان راڤەو تەرجوومە کراوە ، وە تا ئێستاش گەلێ لە ئامۆژگارییەکانی ماوە ٠

چوارەم : حەزرەتی ـ هوود ـە ، وە یەکێ لە موعجیزەکانی حەزرەتی ـ هوود ـ ئەمە بوو : کاتێ کە خوا رەوانەی فەرموو بۆ سەر قەومەکەی وە ماوەیەکی زۆر هەوڵی لە گەڵادان کە باوەر بە خوا بێنن بەڵام جگە لە کەمێکی کەم ئەبێ باوەریان پێ نەهێنا ، جا وەك خوا ئەفەرمووێ : بە رەشە بایەکی بە هێز لە ناوی بردن ، ( وأمّا عادٌ فاهلكوا بريح

صرصر عاتية سخّرها عليهم سبع ليال وثمانية أيّام حسوماً فترى القوم فيها صرعى كأنّهم أعجاز نخلٍ خاوية فهل ترى لهم من باقية )[1] واته : كاتێ کە خوا ویستی سزا بنێرێتە خوارەوە بۆ سەر قەومی هوود ، خوای گەورە حەزرەتی هوودو وە ئەوەش لە ئیماندارانەی کە لە گەڵیدا بوون ، ڕزگاری کردن وە کافرەکانیشی بە جارێ لەناو برد ، خوای گەورە ڕوو بە پێغەمبەر ئەفەرمووێ : ئەی ئەگەر بێنیە سەر باسی ـ عاد ـ کە قەومێکی زۆر بە هێز بوون وە شانازییان بە خۆیانەوە ئەکرد جا لە ناو چوون بە هۆی ڕەشە بایەکی زۆر ساردی زۆر بە هێزەوە ، وە ئەو ڕەشە بایە حەوت شەوو هەشت ڕۆژ بێ ووچان دەوامی کرد ، ئەی پێغەمبەر ئەو هۆزە هەموویان وەکوو ـ لق داریان لێ هاتبوو ، وە کوو دار خورما کەوتبوون بە سەر یەکدا ، وە لە ناو چوون وە هەر شوێنەواریشیان نەما .

پێنجەم : حەزرەتی سلێمان ئەم پێغەمبەرە گەورەیە خوا گەلێ موعجیزەی بەرزی پێ بەخشیبوو ، یەکێ لەو موعجیزانە ئەمە بوو لە زمانی هەموو گیان لەبەرێ تێ ئەگەیشتو گفتوگۆی لە گەڵ ئەکردن ، وە ئاوو هەواو جنۆکەو باڵندەو گیانەوەر بە گشتی لە ژێر دەسەلاتی ئەوودا بوو ، هەتا لە ماوەی چاو تروکاندنێکا بە هۆی جنۆکەیەکەوە کۆشکی بەلقیسی لە شامەوە گوێزرایەوە وە هێنای بۆ فەلەستین بۆ لای

---

١ ـ سورەتی ( الحاقة ) ئایەتی ـ ٨ ـ
ـ صر صر ـ بە بای زۆر بەتین یا زۆر سارد ، یا زۆر گەرم ئەووترێ ، ـ عاتیة ـ بە بایەك ئەوترێ لە ئەوپەڕی هێزوو قوەتا بێ .

حەزرەتی سلێمان •

شەشەم حەزرەتی ئیبراهیم ئەم پێغەمەرە گەورەیە کاتێ کە نەمروود مەنجەنیقەکەی بۆ ئامادە کرد جا حەزرەتی ئیبراهیم بە هێزی باوەڕەوە ناووی خوای هێناو بازی دایە ناو ئاگرکەوە وە لەو کاتەدا خوا بە فریـا پێغەمـەری خـۆیو خۆشەویسـتی کەووتو فەرمووی ، [ یا نارُ کوني بردا وسلاماً علی أبراهیم ] واتە ئەی ئاگر ساردبە = ساردێکی سەلامەتو بێ زیان بە لە سەر ئیبراهیم •

حەوتەم باسی حەزرەتی مووسایە ئەم پێغەمەرە مەزنـە کاتێ کە بیویستایە عەساکەی فڕێ ئەداوو خیرا ئەبوو بـــە ئەژدیها وە ئەژدیهای جادووگەرانی بە جارێ هەڵ ئەلووشی

هەشتەم باسی حەزرەتی عیسایە ئەم پێغەمەرە مەزنە هـەر لە دایـك بوونـی مووعجیزەبوو کاتـی کە هاتە جیهانەوە دلیان لێ پیس کرد مەریەم هێمای بۆ مناڵەکە کرد ( قال إنّي عبدالله آتینّي الکتاب وَجعلني نبیّاً ) فەرمووی من عەبدی خـوام وە لە مەولا لە لایەن خواوە پەرتووکم بۆیو وە ئەبم بە پێغەمەر •

وەنۆیەم باسی حەزرەتی ـ محمد ـە کە گەورەترین پێغەمەرەو سەرداری هەموو پێغەمەرانـە بـە گشتـی ، وە هـەر وەهـا گەورەترین مووعجیزەش لە ناوو مووعجیـزەی پێغەمەرانـدا مووعجیزەی پێغەمەری خۆشەویستمانە کە هەتا ڕۆژی دوایـی هەر ئەمێنێ ، کە ئەویش قورئانی پیـرۆزە ، وە هـەر گیـز گۆڕاندنی بە سەردا نایەت ، وە خوا خۆی لە دەستی دوژمنانی دەیپارێزێ •

جا وەك دەڵێن : مشتێ نموونەی خەروارێکە ، ئێمەش بەم

ئەندازە کەمە دوایی بەم باسە دێنین و دەڵێن کۆتاییە .

## ( ڕەوان بێژی قورئان )

ئەگەر بە وردی لە قورئان وورد ببینەوە وە بیر لە مانا و واتاکانی بکەینەوە ، ئەوجا کەمێ لە نهێنیەکانی قورئانمان بۆ ئاشکرا دەبێ جا یەکێ لەو نهێنیانە ئەمەیە : کە لە قورئانا دووپارە کردنەوە هاتووە بەم جۆرە ئەو باسە لە سورەتێکدا کورتەو وە لە یەکێکی تردا درێژە ، وە ئەم تیکرار کردنەوەیە جوانترین بەیان و ڕەوان بێژی و جوانکاری تێدایە کە هەرچی شێوەی داڕشتن هەیە وە بە هەرزمانی بگوترێ و داڕێژرێ ، وە بە هەر پێنووسێ بنووسرێ وە بە زانیاری هەر زانایەک دانرێ و داڕێژرێ ، هەر گیز ناگاتە بەیان و ڕەوان بێژی و جوانکاری ئایەتێ لە ئایەتەکانی قورئان ، وە بەڵگەش بۆ ئەم ڕاستیە ئەمەیە : لەوەتەی قورئان لە لایەن خواوە کراوەتە خەڵات بۆ پێغەمبەر ، کە پتر لە هزار و چوار سەد ساڵ لەمە پێش تا ئێستا دوژمنانی ئاین و ئیسلام لە هەوڵ و کۆششێکی بێ ووچاندان ، کە قورئان بگۆڕن وە یا هەڵەی زانیاریانەی لێ بگرن یا هەندێ دەست کاری بکەن ، یا خود لای کەمی ئایەتێ یا ووشەیێ یا پیتێ تەنانەت نوختەیێ یا سەرێ بۆرێ ژێرێکی لێ زیاد یا کەم کەنەوە ، یا هەر هیچ نەبێ سوورەتێ یا ئایەتێ بە شێوەی قورئان دابنێن ، بەڵام تا ئێستا نەیان توانیوە وە هەر گیز لە مەولاش ناتوانن !؟ کەواتە : ئەبێ مل کەچی توانایی کەسێ بین کە تواناتری دەسەلات دارانە[1] .

1 ــ سەیر لەوەدایە کام باسەی زۆر سەیر و سەمەرەیە کام چیرۆکەی کە زۆر دڵ تەزێنە ، ئەگەر چەند

## [ پێغەمەران چەندن ؟ ]

ژمارەی پێغەمەرانو نەبییەکان زۆرن وە جگە لە خوا کەس نایزانێ چەندن ، بەڵام ئەوانەی کە لە قورئانا خـوا نـاووی بردوون بیستو پێنج پێغەمەرن ، وە پێویستە لە سەر هەمووما‌ن کە باوەڕمان پێیانهەبێ ، وە ئەمانەن ٠

١ ـ ئادەم ٢ ـ نووح ٣ ـ ئیدریس ٤ ـ هوود ٥ ـ صالح ٦ ـ ئیبراهیم ٨ ـ لووط ٧ ـ ئیسماعیـل ٩ ـ ئیسـحاق ١٠ـ یەعقووب ١١ ـ یوسف ١٢ ـ شوعەیب ١٣ ـ ئەیووب ١٤ـ ذو الکیفل ١٥ ـ مووسا ١٦ ـ هاروون ١٧ ـ داوود ١٨ـ سلێمان ١٩ ـ ئیلیاس ٢٠ ـ الیسـع ٢١ ـ یوونـس ٢٢ـ زکریـا ٢٣ ـ یحـیی ٢٤ ـ عیسـا ٢٥ ـ محمـد ـ پێغەمەری خۆشەویستمان درودوو سـەلامی خوایان لـە سـەر بـێ ٠

( ناوی ئەوسورەت و ئایەتانەی )
( کە باسی ئادەمی تیادا کراوە )

| ژمارەی سوورەت | | ناوی سوورەت | | ژمارەی ئایەت |
|---|---|---|---|---|
| ١ ـ | = | البقرة | = | ٣١ ، ٣٣ ، ٣٥ ، ٣٧ |
| ٢ ـ | = | آل عمران | | ٣٣ ، ٥٩ ٠ |

جارێ خوێندنەوە یا گوێت لێ بوو لێـی‌ی مانـدوو شەکەت دەبی کەچی قورئان بە پێچەوا نەوە هەر چەند بی‌خوێنیتەوە یاگوێی بۆشل کەیت جار لە جار واتای تازە ترو ڕەوانبێژی وجوان کاری لێ تێ دەگەیت وە هەر گیز لێی شەکەتو ماندوو نابی ، ٠ م ـ ن

| | |
|---|---|
| المائدة | ٢٧ • |
| الأعراف | ١١ ، ١٩ ، ٢٦ ، ٢٧، ٣١ ، ٣٥ ، ١٧٢ • |
| الأسراء | ٦١ ، ٧٠ • |
| الكهف | ٥٠ • |
| مريم | ٥٨ • |
| طـــه | ١١٥ ، ١١٦ ، ١١٧، ١٢٠ ، ١٢١ • |
| ٩ ــ يس | ٦٠ ،[1] • |

ئيبنو حەبيان دەيگێڕێتـەوە ئەويش لە ئەبـوو زەڕری غەففارييەوە (خ) دەڵێ : گوتم بە پێغەمـەر ــ د ــ ئەبييەكـان ژمارەيان چەندە ؟ پێغەمەر فەرمووی سەدوو بيستو چوار هەزار نەبی هەيە ، دەڵێ پێم گوت پێغەمەران چەندە ؟ فەرمووی سێ سەدو و سيازدەن كۆمەڵێكی زۆرن[2] ، بەڵام لە بەر ئەوەی كـه خەبەری ئاحادە واتە موتەواتـەر نييـه و ، جێگـەی بـاوەڕی تەواو نييە بەڵكوو گورمان دەگەيەنێ •

خوێنەری بەڕێز : خوای گەورە فەرمانی داوە بـە هەموو خاوەن باوەڕەكان كە ئەمر بە چاكەو نەهی لە خراپە بكەن ، وە ڕێنمايی كردووين كە بە جوانترين،شێوەی نا خاوتن ئامۆژگاری بكەين وە هەر يەكەمان بە گوێرەی زانينو توانينی خۆمـــان پێويستە قۆڵی مەردايەتی لێ هەڵماڵينو دريغی نەكـەين ، وە ئەركی سەرشانمان تاڕادەی جێ بە جێ بكەين ، وە خەڵكی خوا

1 ــ قصص الأنبياء ، عبدالوهاب النجار •
2 ــ تنوير القلوب لاپەرە ٣١ •

بانگ بکەین بۆ ڕێگەی چاکەو باوەڕ بە خوا ، وە بەرگری لەوکەسانە بکەین کە ڕێگەی چەوتیان گرتووە ، وە پەیڕەوی ئەم فەرمایشتەی خوا بکەن ، جگە لە ڕەزامەندی خوا بە هیچ نیازوو مەبەستێ ڕوو بە ڕوو نەبین ، خوا ئەفەرمووێ ( أدع الى سبيل ربك بالحكمة والموعظة الحسنة وجادلهم بالتي هي احسن )واتە : ئەیٰ پێغەمەر تۆ بەندەکانی خوا بانگ بکە بۆ ڕێگەی ڕاستو باوەڕ بە خوا ، بە گوتەی نەرمو نیان بە زانستی و ـ حیکمەت ـ بە ئامۆژگاری جوانو شیرین ، وە کێشەیان لە گەلدا بکەن ، بەلام بە باشترین شێوەی ئاخاوتن ، جا هەر کەسێ مرۆیەکی خوار بێنێتە سەر ڕێگای ڕاستو باوەڕ بە خوا ئەوە لە سامانی دونیا بۆ ئەو کەسە باشترە ٠

بەلام هەرگیز خوا داوای لە ئێمە نەکردووە کە بە زۆر بچەقینە ملی زەلامو نوێژوو ڕۆژوو کردەوەی چاکەی پێ بکەین هەر وەکوو گەلێ کەس بە هەلەدا چوون لەم ڕووەوە بە خۆڕایی خۆیان ماندوو ئەکەن ، ئەو کەسانە بە خەیالی خۆیان بە هیوای پاداشتن ، بەلام بە گوێرەی فەرموودەی خواو پێغەمەر ئەو کەسانە سزایەکی سەخت چاوەڕێیانە چونکە هەرگیز خوا تەکلیفی لە هیچ پێغەمەرێ نەکردووە کە ئاینەکەی بە زۆر بسەپێنێ بە سەر خەلکیدا ، چۆن وانیە : خوا ئەفەرمووێ ( لا إكراه في الدين )واتە : زۆرکاری لە ئاینی ئیسلامدا نییە٠

کاتێ کە پێغەمەری خۆشەویست خەریک ئامۆژگاری بێ باوەڕەکانی ، قورەیش بوو وە زۆری پێ خۆش بوو کە ئەو گەورە پیاوانە ئیمانبێنن ، لە بەر ئەوەی ئاینی ئیسلام بە هێز بێو پەرە بسەنێو وە پەیامەکەی بەخەلکی ڕاگەیەنێ وە لە

هەمان کاتیشدا هەمووبان خزمو عەشرەتی پێغەمبەر بوونو خوا ئەمری پێ کردبوو کە هەرەشە بکا لە خـزمو عەشرەتەکـەیو ئاینی ئیسلامیان پێ ڕاگەیەنـێ پێغەمـبەری ئیسـلام کـۆڕوو کۆمەڵێکی ڕێك خستبوو ئامۆژگاری ئەکـردنو بەڵگـەی بـۆ ئەهێنانەوە کە باوەڕ بە خوا بێنن لەم کاتـەدا کوێـری کـــە عەبدوللای ئومی مەکتوومی ناوو بوو هات بۆ خزمەت پێغەمبەروو هەر لە دوورەوە گوتی : ( یا رسول اللّه علّمني ممّا علّمك اللّه) واتە : ئەی پێغەمبەری خوا فێرم کە لەوەی کە خوا فێری کردووی لە باسای ئاینی ئیسلام ، پێغەمبەر لەم کاتەدا ڕووی گرژ کردوو ڕووی لە کوێرەکە وەرچەرخاند .

جا ئایەتی عیتابو گلەی هاتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر وەك خوا ئەفەرمووێ [ عبس ً وتو ّلى ان جاءه الاعمىٰ وما يدريك لعلّه يز ّكى ] هەتا ــ ( كلاّ ً إ نها تذكرة )[1] واتە : کاتی کە کوێرەکە هاتە خزمەت پێغەمبەر پێغەمبەر پێی ناخۆش بوو ڕووی لــێ وەر گەڕانو ڕۆیشتەوە بۆ ماڵەوە ، وە کوێرەکـەش لـەو کاتـەدا نەیزانی کەوا پێغەمبەر مەشغوڵە جا لە دوای هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانە ، هەر کاتێ پێغەمبەر عەبدوللای کـوڕی ئوومـی مەکتوومی چـاو پێبکەوتایـە پێـی ئەفەرمـوو : مەرحەبـا لە کەسێ کە بە هۆی ئەوەوە خوا گلەیی لێ کردمو عیتـابی لـێ گرتم .

وە هەر وەها خوا ئەفەرمووێ بە پێغەمبەر [ انّك لاتهدى من أحببت ولكنّ اللّه يهدى من يشاء ]واتە ئەی پێغەمـبەری خـوا

1 ــ ئایەتی ــ 1 ــ تا ــ 12 ــ سوورەتی ــ عبس ــ .

تۆ ناتوانی خەلقی هیدایەت لە دلی ئەو کەسانەدا بکەیت کە خۆشت ئەوێن ، وە ناتوانی باوەڕ بهاوێتە دلیانەوە ، بەلکوو خوا ئەتوانێ باوەڕ بهاوێتە دلی ئەو کەسانەوە کە خۆی ئارەزووی هەیە ، بەلکوو پێغەمبەران بە گشتی هەر تەبلیغو ڕاگەیاندنیان لە سەرە وەك خوا ئەفەرمووێ [ وما على الرّسول إلا البلاغ ]واتە : جگە لە ڕێگە پیشاندانو ڕاگەیاندن پێغەمەران هیچیدیان لە سەر نییە ، جا ترخوا ئەوانەی هانی خەلکی ئەدەنو ئیغرایان ئەکەنو لەدوایدا تووشی تەنگەو چەلەمەی ناهەموار دێن ئایا ئەمەکارێکی پەسەندە یاناپەسەندە ؟ ٠

هەتا گەلێ لە زانایان بە لایانەوە پەسەند نیە ڕاچوون لە عیلموزانینی عەقائیدا وە بەرگریان لێ کردووە ، هەر وەها خوا ئەفەرمووێ ، [ انّا هديناه السبيل امّا شاكرا وامّا كفوراً ]واتە : ئێمە دوو ڕێگەمان نیشانی ئادەمیزاد داوە وە بۆمان ڕوون کردووەتەوە ڕێگەی ڕاستکە خاوەنەکەی ئەبا بەرەو بەهەشتو ڕەزامەندی خوا ، وە ڕێگەی چەووت کە خاوەنەکەی ئەبا بەرەوو دۆزەخو قاری خوا ٠

جا هەر کەسێ هەر ڕێگەیەکیان هەل دەبژێرێ خۆی بەر پرسیارە وە بە ئارەزوو مەیلی خۆیەتی ٠

هەر وەها پێغەمبەر فەرموویەتی لە حەدیسی قودسیا خوا ئەفەرمووێ ، ئەی بەندەکانم زەرەروو زیانی ئێوە ناگاتە من تازییانم پێ بگەیەنن ، وە سوودیشتان ناگاتە من تا سوودم پێ بگەیەنن ، ئەی بەندەکانم ئەگەر پێشتو هەوەلتانو دوایتان ئادەمیزادوو جنۆکەتان لە سەر دلو باوەڕی چاکترین پیاوێ لە ئێوە وە بۆ پەرستنو بەندایەتیم بکەن لە مولکی من

کەردیلەیێ چەندە زیاد ناکات ! ٠

ئەی بەندەکـانم ئەگـە ڕیێـت و هەوەڵتـان و دوایشـان ئادەمیزادوو جنۆکەتان لە سەر دڵو باوەڕی خراپترین پیاوێبێ

لە ئێوەو گوناەو خراپە بکەن هیچ شتێ هەتا گەردیلەی لە ملکـی من کەم ناکەنەوە ٠

جا خوێنەری بەڕێز وێنەی مـن و ئەوکەسـەش کـە ئەم پەرتووکە ئەخوێنێتەوە دەقاو دەق وەکوو ئەو پیـاوە وایە کـە خوا کوڕێکی خێلی پێ بەخشی ، کاتێ کە کورەکەی گەورە بوو سەیری ئاسمانی دەکرد ، مانگی بەدوو مانگ بەر چاو دەکەووت، هەتا وای لێهات گومانی لەوەدا نەبوو کە دوو ئەستورك (قورص) بە ئاسمانەوە هەیە ، جا باوکی پێی گوت کوڕم یەك مانگ هەیە، وە تۆ بە دوو مانگ دێتە بەر چاووت خەتای چاوە خیلەکەتـە ، ئەتۆ چاوە ئەخۆشەکەت ببەستەوە بە چاوە ساغەکەت سـەیری ئاسمان بکە ، کاتێ ئەم کارەی ئەنجامدا کوڕەکە گومانێ تری بۆ هاتە گۆڕێ،وە بە باوکی گوت ئێستا یەك ئەستوورك ئەبینم چونکە بە یەك چاووم سەیری ئاسمان دەکەم ، ئەوجا باوکی پێی گوت کوڕم ئەگەر وایە هەر وەکوو خۆت دەڵێـی ئەمجـارە چـاوە ساغەکەت بگرەو بە چاوە تیلەکەت سەیری ئاسمان بکە ، کاتـێ کە ئەم کارەی کرد بۆی دەرکەووت کە بەهەڵەدا چووە وە قسەکەی باوکی ڕاستە[1] !؟٠

١ ـ تلبیس أبلیس ، لاپەڕە ـ ٤٠ ـ ٠

سوپاس :ـ

بۆ خاوەنی چاپخانەی جاحیظ وە هەروەها کارگێرانی کە یارمەتمی لە چاپدانی ئـەم پەرتووکەیان دام .

محی‌الدین عبدالقادر

# برهـان التطـابق

## حـــول

## تاريـخ الحيـاة

تاليـف

محي‌الدين عبدالقادر محمد

القرەداغـي

---

الطبعة الاولى

